زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەلقەی چوارەم

عەلی باپیر

# چۆنیەتی بوونی پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەری

نوزادە



بڵاوکردنەوەی بنکەی



بە چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و

بنیاتنانی بنکەی جەماوەری

# چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەری

عەلی باپیر




بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن

بسم الله الرّحمن الرّحيم

﴿ وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾

(التوبة –١٠٥)

## پێشکەش بێ:

به هەموو ئەوانەی بە شێوەیەك لە شێوەكان لە مەیدانی كـاری ئیسلامیی دا دەجوولێن و مـشووی كـاروان و پـڕۆژەی ئیـسلامیی كوردستان و عێراق دەخۆن.

# پێشەکی

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه

بەڕێزان!

هیچ گومانی تێدا نیە کە زانیاری و شارەزایی و بەرچاو ڕوونی مەرجی یەکەم و بناغەی هەر کارو چالاکییەکە کە بویستریّ سەروبەر بگریّ، وە بە پێچەوانەشەوە نەزانیی و نەشارەزایی و ناشێیی کوشندەترین دەردو نەخۆشییەو مایەی ڕەنج بەخەساریی و پەشێمانیی و دەست لە بنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچوونە.

هەر بۆیەش خوای کاربەجێ (سبحانەوتعالی) بەندە چاك و هەڵبژاردەکانی خۆی کە لە کتێب و هیدایەتەکەی بەهرەمەند دەبن بە ئەهلی عەقڵ و فیکرو تێگەیشتن و زانیاری وەسف کردوە، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿كَذَلِكَ يُبَيِّـنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (البقرة ٢٤٢)

٢-﴿كَذَلِكَ يُبيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾(البقرة ٢١٩)

٣-﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (البقرة -٢٣٠)

٤- ﴿ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ (الأنعام ٩٨)

جا بەڕێزان ئەم نووسینەی[١] بەردەستتان هەوڵ و هەنگاوێکی دیکەی بەندەیە بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونکردنەوەو سەر ڕاست کردن و شارەزاکردنی ڕێبوارانی ڕێی کاری ئیسلامیی و کاروانی دینداریی و بەرەو خوا چوون و هەوڵمداوە کە لە دوو تەوەرەدا تیشك بخەمە سەر دوو بابەتی گەورەو گرنگی کاروچالاکی ئیسلامیی لە واقیعی ئەمڕۆی کوردستان دا کە بریتین لە: (چۆنیەتی بوونە پێشەنگ)و (چۆنیەتی بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی) وە بۆ هەر کامێکیان حەوت (٧) هۆکارم باسکردوون کە پێم وایە لەم هەلومەرجەماندا گرنگترین هۆکارن، ئەگەرنا بێگومان هۆکاری دیکەش هەن.

ئاشکراشە کە ئامانجی کۆتایی دنیایی کاروچالاکی ئیسلامیی بریتییە لە هێنانەوەی کۆمەڵگاو کیانێکی ئیسلامیی کە هەڵدەستێ بە جێبەجێکردن و پیادەکردنی شەریعەتی خوا لە واقیعی هەمەلایەنەی ژیان و گوزەرانی داو، ئەو ئامانجە گرنگ و ستراتیژیی یەش بەبێ هەردووك پایەی گرنگ و بنەڕەتی: (پێشەکی هەڵبژاردە)و (بنکەی جەماوەریی) مەیسەر نابێ.

بۆیە بە پێویستم زانی کە لە دوو توێی ئەم وتارەدا گرنگترین هۆکارەکانی هێنانەدی هەر کام لەو دوو پایە گرنگ و بنەڕەتی یە بخەمە ڕوو.

---

(١) کە لە ئەسڵ دا وتارێك بووە لە کۆڕێك دا لە (٢٠٠٦/٧/١٤) لە هەولێر، دراوە وە لە لایەن کاك پێشڕەوەوە هێنراوەتە سەر کاغەز خوا پاداشتتی بداتەوە.

خواش به لوطف وكەرەمی بێ سنووری خۆی یارمەتیمان بدات كە هەرچی زیاتر زانیاری و شارەزایی و بەرچاوڕوونی لە دین و ژینماندا وەدەست بێنین و پاشان تۆفیقی كاركردن و بەرێوەچوونیشمان بە پێی ئەو زانیاری و شارەزایی و بەرچاو ڕوونی یە پێ ببەخشێ، چونكە بێگومان بەرەكەتی زانیاری و شارەزایی و بەرهەمەكەی لە كارپێكردنی دایەو هەر زانیاری یەك خاوەنەكەی لە ئیش پێكردنی مەحڕووم بێت لەسەری قەرزدار و عەیبدار و گوناهبارە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك.

٢٣ رمضان ١٤٢٧

١٣ / ١٠ / ٢٠٠٦

هەولێر

# دەستپێك

بەڕێزان !

ئەو بابەتەی بۆم ئامادەکردوون ناونیشانەکەی بەو شێوەیەیە:

## چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی

مەبەستیشم لەم ناونیشانە ئەوەیە کە کاری ئیسلامی بە بێ هەبوونی ئەو دوو پایە بنەڕەتی یە بە ئەنجام ناگات: کۆمەڵێکی پێشەنگ و بنکەیەکی جەماوەریی، ئاشکراشە کە ئەنجامی کۆتایی (دنیایی) هەر کۆمەڵ و جم وجۆڵێکی ئیسلامی بریتیە لە جێبەجێکردنی فەرمانی خوا کە دەفەرمووێ: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا ... ﴾(الشورى -١٣)، واتە: ئەو (دین)و بەرنامەیەی کە خوا ناردوویەتی بەرپای بکەن تێیدا پەرتەوازە مەبن، ئەوە ئەرکی سەرشانی هەموو پێغەمبەران بووە (عليهم الصلاة والسلام) وە ئەرکی سەرشانی شوێن کەوتووانی پێغەمبەرانیشە کە ئەو دین و بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی لە ژیانی خۆیان و کۆمەڵگاکەیاندا بەرپای بکەن چونکە ئەو ڕستەیەی کە خوێندمەوە یەکێکە لە ڕستەکانی ئەم ئایەتە موبارەکەی سورەتی (الشورى) کە دەفەرمووێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا

إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاء وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ (١٣) ﴾

لەم ئايەتەدا خواى پەروەردگار باسى پێنج لە پێغەمبەرە پايە بەرزەكانى دەكات، كە زۆر لە زانايان بە (أولو العزم)يان ناو دەبەن بەڵام بەلاى بەندەوە ڕاى ڕاست ئەوەيە كە ئەوانە پێشەنگ و سەر قافڵەى پێغەمبەرانى (أولو العزم)ن، ئەگەر نا پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەموويان خاوەن عەزم بوون، بەڵام ئەو پێنجەيان بەرزتر و پايە بەرزترن لەوانى ديكە، جا خواى پەروەردگار دەفەرموێ ئەو دينەى كە بۆم داناون ﴿ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ﴾ دەفەرموێ: ئەو بەرنامەيەى بۆم داناون هەمان بەرنامەيە - لە هێڵە گشتييەكانى و لە بنەڕەتە سەرەكييەكانيدا- هەمان دين و بەرنامەيە كە بۆ (نوح و ابراهيم و موسى و عيسى) نێردراوە واتە ئەو پێنج پێغەمبەرە پايەبەرزە (عليهم الصلاة والسلام) بە بەرپاكردنى يەك دين موكەللەف كراون كە ئەويش دينى خواى پەروەردگارەو لە پێغەمبەرێكەو بۆ پێغەمبەرێكى ديكەو لە قۆناغێكەوە بۆ قۆناغێكى ديكە تەنها لە تەفاصيل و جوزئياتيدا گۆڕاوە ئەگەرنا لە بنچينەو بنەڕەتەكانيدا يەك بووە دينى خواى پەروەردگار يەكە وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ ﴾ (آل عمران ١٩)

دین له لای خوا تەنیا ئیسلامه، واته (دین)ێك كـه لـه لای خـوا ڕەوایـه تـەنیا ئیـسلامه، واتـه: (دیـن)ێـك كـه خـوا بـۆ هـەموو پێغەمبەرانی نـاردوه (علـیهم الـصلاة والـسلام) تـەنیا ئیـسلامه، ئیسلام و بـه چـەمك و واتـا حـەقیقی و زمانەوانییەكـەی نـەك بـه مەفهوومه عورفییەكەی كه ئیسلام به مەفهوومی عـورفی بریتیـه لەو شەریعەتەی كه بۆ محمد ﷺ پێغەمبەری كۆتایی نێـردراوە، جـا بۆیه من ئەم سەرباسەم هەڵبژارد چونكه ئەنجامی وەبەرهـەمی هـەر كارو جموجۆڵێكی ڕەسەنی ئیسلامی ئەوەیـه كـه دینـی خـوا بـەرپا بكات: (أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ ...) هەموو پێغەمبەران هـاتوون كـه دیـن بەرپا بكەن، دین بۆیه هاتوە ئیقامـه بكـرێ خـوای پـەروەردگار كـه باسی نوێژ دەكات، دەفەرموێ (أقيموا الصلاة) نوێژ بەرپا بكەن واته بەو شێوەیەی كه خوا فەرزی كردوه بەرپای بكەن، چونكه بـەرپاكردن ئەوەیه كه بوون و وجوودێك بەو شته ببەخشێ كه تێیدا داوا كراوە وە بەو شێوەیه جێبەجێی بكەی كه فەرمانی پێ كراوە، دەگوترێ (أقـام البُنیان) واته: دیوارەكانی ڕاســت كردنـەوە بینایەكـەی تـەواوكرد، ئیقامەی هەر شتێك بریتیه له جێبەجێكردنی ئەو شته به تـەواوی، جا خوای كاربەجێ دەفەرموێ: (أَنْ أَقِيمُوا الـدِّينَ ...) واته: دین بەرپا بكەن، ئایا دین چۆن بەرپا دەبێ؟!! دیاره له ئەنجامی ئیش بۆكردنداو له ئەنجامی كار بۆكردن و خـەم لـێخواردندا، جـا مـن باسـی دوو شادەماری وە دوو پایەی بنەڕەتی بەرپاكردنی دینتان بۆ دەكـەم، دیـن

چۆن بـەرپا دەبـێ؟! بـە دوو شـــتان یەکـەم: هـەبوونی کۆمـەڵێکی پێشـەنگ، کۆمەڵە خەڵکێك کە ڕێگە بشـکێنن و ببنە سـەرقافڵە، ببنە ڕێ پیشاندەر، ببنە چاوساغ بۆ دەوروبـەرو کۆمـەڵگایان. دووەم: هەبوونی بنکەیەکی جەماوەریی، چونکە دەبێ وێڕای ئەوەی خەڵکێك دەبن ڕێگە دەشـکێنن و دەبنە پێشـەنگ سـەرقافڵە، دەبنە چاوساغ و خەڵك فێری دینداریی دەکەن، خەڵك فێری خواپەرسـتی دەکـەن، بـە زمانی کردارو حاڵ پێش زمانی وتارو مەقال، بە جۆرێك هەر کەسێك تەماشایان بکات و لـێیان ورد بێتەوە، دینداریی و مسـوڵمانەتی و بەندایەتی بۆ خوا دەبینـێ لـە هەڵسوکەتیاندا، هەڵسـوکـــەوتی تاکیی یان خێزانی یان کۆمەڵایەتی یان، ئینجـا وێـرای ئـەوە دەبـێ بنکەیەکی جەماوەرییش هەبێ کە بـە تەئکیـد بنکـەی جـەماوەریی یاخود ڕایەکی گشتیش، خەڵك لەگەڵ دابوونێکیش و ئـەوە کـە ئـەو کۆمەڵە بتوانێ تەوژمێك دروسـت بکـات، ئـەویش هـەر بەرهـەمی کارو چالاکی و کردو کۆششی ئەو کۆمەڵەیە کە دەبنە پێشەنگ، جا من باسی ئەوە دەکـەم کـە کۆمـەڵێکی ئیـسلامیی چـۆن دەبـن بـە پێشـەنگ، ئەو هۆکارانە چین کە دەبێ لە خۆیانیان دا بیـان هێننـە دی بۆ ئەوەی ببن بە پێشـەنگ، ببن بە سـەر قافڵە، ئەوە لە لایەك، وە پاشـان ئـەو هۆکارانـەش چـین کـە دەتـوانین بـە هۆیانـەوە بنکـەی جەماوەریی دروسـت بکەن، بنکەی جەماوەریی بنیات بنێن؟! چونکە ئێمە ئەگەر تەماشای سیرەو ژیـانی پێغەمبـەر بکـەین (صـەلات و

سەلامی خوای لەسەر بێ) ئدیـارە ئـەوەی گـوتم شـتێکی واقیعـی و عەقڵی یـەو هـەر شـتێك واقیعـی و عـەقڵی بـوو ئەگـەر بەڵگـەی شەرعیشی لەسەر نەهێنیەوە زیانی نیـە، چـونکە هـەر شـتێك کـە واقیعی بوو لە واقیعدا هەبوو، وە عەقڵ پێویستی کرد، پێویستی بە بەڵگەی شەرعی ناکات، بۆ نموونە: ئەگەر بڵێین: دەبێ ئینسان بەچـاو ببینـێ، بـە گـوێ ببیـستێ، ئـەو شـتێکی عـەقڵی واقیعـی یـەو پێویسـتی بە بەڵگەی شەرعی ناکـات، بـەڵام وێـڕای ئـەوەش ئێمـە ئەگەر تەماشای سـیرەو ژیـانی پێغەمبـەر بکـەین (علیـه الـصلاة والسلام) چی دەبینین؟!

سەرەتا هەوڵی داوە پێشەنگێك، کۆمەڵێك کە دەبنە پێـشـەنگ و سەرقافڵە پەروەردە بکات و بخەملێنی و ئامادە بکات، پاشان خـەمی خواردوەو مشووری خواردوە لە پەیداکردنی بنکەیـەکی جـەماوەریی، پێغەمبەر ﷺ سـێزدە سـاڵان کـە لـە مەککـە خـەریکی کـاری ئیسلامی بوو ئامانجی ئەوە بوو کـە کۆمـەڵێك پەیـدا بکـات ببنـە پێشـەنگ، پاشان لە سـاڵی (١٠-١١) دەیـەم و یازدەیەمـەوە دوای ئەوەی لە مەککە گەیشتە بن بەست و زانی کە کۆمەڵگای مەککـە، خەڵکی مەککە بە کەڵکی ئەوە نایەن کیان و قەوارەیەکی ئیسلامی یان لە نێودا جاڕ بدرێ و ڕابگەیەندرێ وە ئامادەیی ئەوەیان نیـە کـە دەوڵـەت و کیانێکی ئیسلامی لەوێدا فەراهـەم بێـت و برەخسێ، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کەوتە بیری ئەوە کە لە شوێنێکی

دیکە بنکەی جەماوەریی بۆ خۆی دروست بکا، ئەوە بوو کە سەرەنجام دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆری ڕێی بە یەثریبی یەکان کەوت، وە نوێنەرانی (ئەوس وخەزرەج) بە سێ قۆناغان زەمینەی دروستکردنی بنکەی جەماوەریی یان لە(یثرب) بۆ ڕەخساند، قۆناغی یەکەم کە لە ساڵی یازدەمی کۆچی دابوو تەنیا وەکو یەکتر ناسین و بە یەکتر ئاشنا بوون بوو لەگەڵ شەش کەس لە تیرەی (خەزرەج). لە قۆناغی دووەم دا ئەوەبوو کە لە ساڵی دوازدەیەم دا پەیمانی یەکەمی عەقەبە بەسترا، وە قۆناغی سێیەم لە ساڵی سێزدەیەم دا بوو کە پەیمانی دووەمی عەقەبە بەسترا وە بنکەی جەماوەریی بۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە یەثریب — کە دوایی ناوی گۆڕدار بۆ مەدینە — پەیدا بوو بە بەڵگەی ئەوە کە (ابن هشام) لە سیرەکەی خۆیدا وە باقی مێژوونووسان لەو بارەوە گوتوویانە: (لم یبق دار من دور الأنصار الا وَ دخله الإسلام) واتە: هیچ گەڕەکێك لە هی ئەنصاری یەکان واتە لە خەڵکی یەثریب — نەما مەگەر ئیسلامی چووە نێو و ئیسلامی تێدا بڵاو بۆوە، کەواتە لەوێ بنکەی جەماوەریی دروست بوو.جا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەو پێشەنگە ئیسلامی یەی کە لە مەککە پەروەردەی کردبوون لەگەڵ ئەو بنکە جەماوەرییەی کە لە (یەثریب) ڕەخسابوو و خەملی بوو، لە یەك دان و پێکەوەی ئاوێتە کردن، دوای ئەوەی کە مۆڵەتی دا هاوەڵانی بەڕێزی کۆچیان کردو پاشان بۆ خۆشی بە دوایاندا کۆچی کرد، وە سەرەنجام ئەو پێشەنگ و

بنكه جه‌ماوه‌ریيه بوونه كۆمه‌ڵگايه‌كی ئیسـلامیی و له هه‌ناوی ئه‌و كۆمه‌ڵگا ئیسـلامییه‌ش كيان و ده‌وڵه‌تێكی ئیسـلامی له‌دايك بوو، دياره هه‌ر كاتێكی ديكه‌ش وه له هه‌ر شوێنێكی ديكه‌ش دا برايـانی خۆشه‌ويستم! بويسـترێ كـاری ئیـسلامی بـه ئـه‌نجام بگـات، ديـاره ئه‌نجامی كۆتايی وه‌كو به‌رهه‌می دونيايی ئه‌گه‌ر نـا كـاری ئینـسانی مسـولْمان هه‌ميشـه هه‌ر به ئه‌نجام گه‌يشـتوويه مادام بۆ خوا كاری كردبێ ئه‌گه‌ر يه‌ك هه‌نگاوی نابێ به‌ره‌و خوا بـه پـێی ئـه‌و نيه‌تـه‌ی خۆی خوای په‌روه‌ردگار كاره‌كه‌ی به ئه‌نجام گه‌ياندوه‌و ئه‌جرو پاداشـتی ده‌داته‌وه، وه‌ك خوای (عزّوجل) فه‌رموويه‌تی ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُـضِيعُ أَجْـرَ الْمُحْـسِنِينَ﴾ (التوبة- ١٢٠) بـه‌لاّم وه‌كـو ئـه‌نجامی دونيـايی-كـاری ئيـسـلامیی پێويـستی بـه دوو پايـه هه‌يـه، يه‌كـه‌م: كۆمـه‌ڵێكی پێشـه‌نگ . دووه‌م: بنكه‌يه‌كی جه‌ماوه‌ريی.

تەوەرەی یەکـەم :

# چۆنیەتی بوونە پێشـەنگ

لایەنێکی ئیسلامیی لە کوردستان و عێراق، لە هەر شوێنێکی دیکەدا، چۆن دەتوانێ ببێتە پێشـەنگ ؟!

دیـاره کۆمــەڵێك هۆکــار هــەن بــەڵام مــن حــەوتیانم لــێ هەڵبژاردوون:

## ١- هـەزمکردنی ئیمـان و عەقیـدەی ڕاسـت و دروسـت:

یەکـەمین هۆکـاری پەیـدابوون و پـەروەردەبوونی کۆمــەڵێکی پێشـەنگ و سەرقافڵە، بەر لە هەموو شـتێك بریتیـە لـە (هـەزم کردنــی ئیمــان و عەقیــدەی ڕاســت و دروســت)، کـە ئـەویش لـە جیهانبینی و تێڕوانینێکی ڕاست و دروست پەیـدا دەبـێ، ئەگـەر تەماشای سـیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەو قورئانە بکەین، کـە پێغەمبەری خوا(علیه الـصلاة والـسلام)و هـاوەڵانی بـەڕێزی ئـەو پێشـەنگەی کە لە مەککــــــە پەروەردەی کردن و تێی گەیاندن و پێی گەیاندن، تەماشا دەکەین هـەمووی لـە دەوری سـێ تـەوەرە دەسـووڕێت:

**تەوەری یەکەم:** لە خەڵك گەیاندنی ئەوە کە خوا (جلّ شأنه) تاکە لە بەدیهێنەرایەتیدا، لە پەروەردگارێتیدا، لە خاوەن دارێتیدا، لە مشوورخۆرێتیدا، لە پەرستراوێتیدا، لە ناوەکانی و لە سیفاتەکانی دا، واتە: خوا بە یەکگرتن (التوحید). جا دیارە ئەوە کاتێك وەکو حاڵەتی فیکریی وەردەگیرێ شتێکە، بەلاّم وەختێك وەکو حاڵەتی دەروونی وەردەگیرێ و هەزم دەکرێ و ئیستیعاب دەکرێ و تەفاعولی لەگەڵ دا دەکرێ شتێکی دیکەیە، چونکە زۆر کەس دەزانێ خوا یەکە (جلّ شأنه) زۆر کەس دەزانێ، بێجگە لە خوا هیچ بەدیهێنەرو هیچ پەروەردگارو هیچ خاوەنی دیکە بۆ بوونەوەرو کائینات نیە، بەلاّم ئەگەر تەماشای ژیانی بکەی وای تێدا نابینی، بۆیە دەبێ ئەو زانینە ببێ بە توانین و حاڵی بوونەکە ببێ بە حاڵ و لە مێشکەوە بێتە نێو دڵ و دەروون، پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) گرنگی و گەورەیی کارەکەی لەوەدا بووە کە وەکو فەیلەسووفێك نەچووە تەنیا خەڵك لە ڕاستی یەکان تێبگەیەنێ، نەچووە تەنها خوا بە خەڵك بناسێنێ بەڵکو هاتوە لەسەر ئەوەش پەروەردەیان بکات و پێیان بگەیەنێ، ئیشەکەی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) تەنیا تێگەیاندن نەبووە بەڵکو پێگەیاندنیش بووە، جا ئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروست

یەکەم هۆکارو یەکەم هـەنگاوی پێگەیـشـتن و دروســـتبوونی پێشەنگێکە کە بتوانن کۆمەڵگای خۆیان بگۆڕن بـەو شـێوەیە بیگۆڕن و بەو ئاڕاسـتەیەدا بیگۆڕن کە شەریعەتی خوا دەیەوێ و خوا پێی خۆشە ڕووی پێ لە قیبلەی خوا بکـەن ڕووی پـێ لـە ڕەزامەندی خوا بکەن، بەڵێ یەکەمین هەنگاوی دروسـت بوونی پێشـەنگێك لە بواری کاری ئیسـلامیی دا بریتیە لە وەرگـرتن و هەزمکردنی ئیمان و عەقیدەی ڕاسـت و دروست ئەو ئیمان و عەقیدەیـە کـە خـوا بـە یـەکگرتن (التوحیـد) وەك کاکڵـەو جەوهەرەکەیەتی.

**تەوەری دووەم:** کـە بریتیـە لـە بـڕوا بـوون بـە پێغەمبەرایـەتی (النبـــوّە) چـونکە ئینـسان ناتوانـێ لـەم ژیانـە دونیابیـەدا ژیانێکی ڕاست و دروسـت بەرێتە سـەر وە ژیـانی خـۆی ڕێـك بخات بەبێ ڕۆشـنایی وەحی و هیدایـەتی خـوای پـەروەردگار و بەبێ دەســت گرتنـی خـوای بەخـشـەر. بـەڵێ بڕوابـوون بـە پێغەمبەرایەتی، واتە: بڕوا بوون بە وەحـی خـوا (عزّوجـل) وە بڕوا بوون بەوە کە بەبێ پەیام و بەرنامەی خوا ئینسان ناتوانـێ ژیانێکی هەبێ، کە جێگەی ڕەزامەندیی خوا بێ.

**تەوەرەی سـێیەم:** کـە بریتیـە لـە ئیمـان بـە ڕۆژی دوایـی، بـە لێپرسـینەوە، بە سـزاو پاداشت، بە بەهەشت و دۆزەخ.

بەڵێ بەڕێزان !

بەردی بناغەی کاری ئیسلامیی بریتیە لە ڕسقاندن و چەسپاندنی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە عەقڵ و دڵی کەسانێکی هەڵبژاردەدا، شایانی باسیشە کە هەرسێك پایەی: خوا بە یەکگرتن و پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی دوایی، پایەو پێکهێنەرەکانی دیکەی ئیمان و عەقیدەش دەگرنە نێوخۆیان .

## ٢- عیبادەت و تەقواو تەزکیە :

هۆکاری دووەم بۆ خەمڵین و پەیدابوونی کۆمەڵێکی پێشەنگ بریتیە لە: (عیبادەت و تەقواو تەزکیە)، دیارە ئەم سێیەش هەر سێکیان پێکەوە پەیوەستن جا عیبادەت ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئیمانەوە هەیەو هەر کەسێك بەڕاستی ئیمانی بە خوا بێت بۆ خوا عابید دەبێ، کەسێکیش بۆ خوا عابید بوو پارێزکار (متقی) دەبێ، کەسێکیش ئەهلی تەقوا بوو نەفسی پاك و چاك (مزکاة) دەبێ . ئەم سێیانە هەموویان تێك هەڵکێشن.

هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) خوا لێیان ڕازی بێ کە ئێمە هەمیشە دەبێ ئەوان بکەینە سەرمەشق وە نموونە بەوان بێنینەوە چونکە خوای پەروەردگار لە قورئانێدا بە هیچ کەسی نەفەرمووە لێیان ڕازیم وە ئەوانیش لە خۆم ڕازی دەکەم لە دوای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) جگە لە

هـــاوەڵانی بـــەڕێزی پێغەمبـــەر (علیـــه الـــصلاة والـــسلام) وەك فەرموویـــەتی: ﴿ وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ﴾ (التوبة ١٠٠)

دیارە هاوەڵانی هەر لە کام پێغەمبەرانی دیکەش هـەروا بـوون، کەواتە: دیـــارە شێوەی دینداری کردن و مـسـوڵمانەتیی کـردن و بەندایەتی بۆ خوا کردنی ئەو هاوەڵـە بەڕێزانـە لای خـوا پەســـند بووەو جێگای ڕەزامەندی بووە، جا ئایـا ئەوانـە چـۆن بـوون؟ دوای ئەوەی کە ئیمان و عەقیدە لە دڵ و دەروونیاندا دامەزراوە، پێـشـێ مێشـکیانی پێ ڕۆشـن بۆتەوەو دوایی دڵیانی پێ ئـاوەدان بۆتـەوە، تەماشـا دەکـەین دوای ئـەوە یەکـسـەر دەسـت یـان کـردوە بـە بەندایەتی کردن بۆ خوا بە هەموو شێوەکانی بەندایەتی پلـە پلـە، چونکە ئەو کاتە پێغەمبەر (علیـه الـصلاة والـسلام) پلـە پلـەو هێدی هێدی ئەرکەکانی شەریعەتی بۆ دابەزیون بەڵام ئێـسـتا وەك ئەو کاتی نیەو ئێمە بە هەموو ئـەوەی پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والسلام) لە خواوە بۆی هاتوە بە پێی توانامان موکەللەفین ئەگەر نا ئەوان وەك عیبادەت لە سـەرەتاوە بەیانیان دوو ڕکات و ئێـواران دوو ڕکات نوێژیان لەسەر پێویست بـووە، وە مانگـێ سـێ ڕۆژوو، دیارە حەج و زەکات و ئەوانەیان لەسەر پێویست نەبووە، بەڵام مـاڵ بەخشین یان بە گشـتی لەسەر پێویسـت بووە، بەبێ دیاری کردنـی ئەندازەو شێوەو ئەوانە، مەبەسـتم ئەوەیە کە بەندایەتی کـردن بـۆ

خوا چ به بەدەن چ بە ماڵ چ لە ڕووی مەعنەویی چ لە ڕووی ماددیی و جەستەیی بە واتای فراوانی عیبادەت، بەڵام بە مەفهوومە باوەکەی چونکە چەمك و واتای ڕاستەقینەی عیبادەت هەموو جموجۆڵ و چالاکییەکانی ئینسان دەگرێتەوە، جا ئێمە لێرەدا ئەو چەمکە باوەی عیبادەتمان مەبەستە، واتە ئەو جۆرە خواپەرستی یانەی کە ئینسان وەك پەیوەندی نێوان خۆی و خوا (عزّوجل) ئەنجامیان دەدات و بەندایەتی خۆییان بۆ خوا تێدا بەرجەستە دەکات، چونکە ئینسان بەندە (عبد)یەو، خوای پەروەردگاریش پەرستراو (إله)ە، جا لە عیبادەتەوە پارێزکاریی (تقوی) پەیدا دەبێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (البقرة -٢١) ئەی خەڵكینە! بەندایەتی بۆ ئەو خوایەتان بکەن کە ئێوەی دروست کردوە وە ئەوانی پێش ئێوەش بۆ ئەوەی تەقواتان پەیدا بێ، کەواتە: لە ئەنجامی عیبادەت دا تەقوا پەیدا دەبێ، وە لە ئەنجامی تەقواش دا تەزکیە پەیدا دەبێ، چونکە خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا (١٠)﴾ (الشمس) واتە: سەرفراز بووە ئەو کەسەی ئەو تەقوایەی کە خوا لە دەروونی دا دایناوە گەشەی پێ دەدات و فراژووی دەکات و سەرەنجام نەفسی خۆی پەروەردە دەکات و زیادی دەکاتوە بەدبەختو

پەشـێمان و زیانبارە ئەو کەسەی کە دەروونی خـۆی دەشـارێتەوە وە بن چڵك و کەمرەی گوناهانی دەخـات، واتـە لایـەنی خراپـەکاریی (فجـور)ەکـەی گەشـە پـێ دەدات و لایـەنی تـەقواو چـاکەکاریی دەشارێتەوە، کەواتە: ڕاسـتە لە ئـەنجامی تـەقوادا تەزکیـە پەیـدا دەبێ و ئەو سـێیانە هەموویان تێك هەڵکێشن و ئەگـەر ئینـسان ئیمانی هەبوو عیبادەتی دەبێ ئەگەر عیبادەتی بوو تەقوای دەبـێ، ئەگەر تەقواش هەبوو نەفس تەزکیە دەبێ، ئینجا ئایـا (تەزکیـە) بوون یانی چی؟ یانی: نەفست پاك و چاك دەبێ، پاك دەبێتەوە لـەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشـن و لێیان بژار دەکرێ و لـە بێـژینگ دەدرێ پاڵفتـە دەبـێ، وە دەش ڕازێندرێتـەوە بـەو سـیفەت و خەسـڵەتانەی کە خوا پێی خۆشـن، بـەڵێ (تزکیـە) یـانی: پـاك بوون و چاك بوون، پاك بی و خۆت دوور بگری لەوەی کە خوا پـێی ناخۆشە، خۆشت بڕازێنیتەوە خۆشـت چاك بکەی بـەو شـێوەی کـە خوای کاربەجێ پێی خۆشـە.

## ٣- ئاکـاری بەرز و ڕەوشتی جوان:

سێیەم لە هۆکارەکانی بوونە پێشـەنگ بریتیە لە ئاکاری بەرزو ڕەوشـتی جوان، ئاکاری بەرزو ڕەوشتی جوان کە پەیوەندی بە نێوان خۆمـان و خەڵکەوە هەیە، دیارە ئەویش دیسان بەرهـەمی ئیمـان و عیبادەتەو کەسێك بە ڕاستی ئیمانی هەبێ و عـابید بێ بۆ خوا بـە

تەئکید ڕەوشتیشی بەرزو جوان دەبێ، بۆیە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((أثقَلُ ما في ميزان العبد المؤمن يوم القيامة حُسنُ الخُلُق)) رواه الترمذي وأحمد

واتە: قورسترین شت لە تەرازووی بەندەی بڕواداردا لە ڕۆژی دوایی‌دا ڕەوشتی بەرزو جوانە، بۆچی؟! چونکە لە ڕاستیدا برایانی خۆشەویستم خووو ڕەوشتی بەرزو جوان بە مەفهوومی فراوانی خوو و ڕەوشت میوەو بەرهەمی ئیمان و عیبادەتو تەقواو تەزکیەیەو لە ئەنجامی هەمووی دا ئینجا ئینسان خوو و ڕەوشتی بەرزو جوان دەبێ، خوای زاناو توانا کە مەدحی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ (القلم ٤) واتە: بێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێکی بەرزو مەزنی، وە ئەوەش دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە (محمد) پێغەمبەری خوایە (علیە الصلاة والسلام) چونکە پێشێ تۆمەتی کافرەکان باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿ ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١) مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ (٢) وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ (٣) وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ (٤) ﴾ (القلم) واتە: نوون سوێند بە قەڵەم و بەوەی دەینووسن، تۆ سوێند بە نیعمەتی خوا (یان ئەتۆ بە هۆی نیعمەتی خواوە کە پێغەمبەرایەتی وەحی یە) تۆ شێت نی (وەك کافرەکان تۆمەتت بۆ هەڵدەبەستن) وە تۆ پاداشتێکی نەبڕاوەت هەیە، دوایی وەك بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوە کە (محمد) شێت نیەو پێغەمبەری خوایە دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ وه بـه ڕاسـتی تـۆ ڕەوشـتێكی بـەرزو مەزنت هەیە، جا ئایا کـەی ئینـسان دەتوانـێ ڕەوشـتێكی بـەرزو مەزنی هەبێ؟! دیارە کاتێك کـە ئیمـانێکی مەحکـەمی هـەبێ و عیبادەتێکی ساغ و بێخلّتەی هـەبێ و تەقوایـەکی باشـی هـەبێ و نەفسی تەزکیە بووبێ، ئەوجار ڕەوشتی بەرزو جوان دەبێ، جا ئـەوە زۆر شتی لـێ وەردەگیرێ، ئێمە جاری وا هەیە تاقەتمان بـە خۆمـان ناشکێ بۆ وێنە بەسەر زمانی خۆماندا زاڵ نابین کە وەعدە خـیلاف نەکەین، درۆی پێ نەکەین، دوو زمانی پێ نەکەین، غەیبـەتی پـێ نەکەین، یان بەسەر دڵی خۆماندا زاڵ نابین کـە گومـانی خـراپ و (سـوء الظن)ی تێدا نەبێ، حەسەدی تێـدا نـەبێ، بـوغزو کینـەی بەرامبەر بە مسوڵمانان تێدا نەبێ، خۆبەزلگریی تێدا نـەبێ، یـان بەسـەر چاوی خۆماندا زاڵ نابین کە ڕوانینی حەرامی پێ نەکـەین، یا بەسـەر گوێدا کە بۆ غەیبەت و قسەی خـراپ ڕای نـەدێرین، وە هەروەها، جا بۆ ئەوانە هەموویان دەبێ بگەڕێینەوە تـاکو لـە خـۆ چاککردنەکەماندا تووشی فەشەل نـەبین — دەبـێ بگەڕێینـەوە بـۆ پێشـێ، وەختێك بەسەر چاوتدا، بەسـەر دڵتـدا، بەسـەر زمانتـدا، بەسـەر زەینتـدا، بەسـەر گوێتـدا، بەسـەر ئەندامـە ئاشـکراو پەنهانەکانتدا، زاڵ دەبی، کە خـاوەنی ئـەو شـتانەی پێـشەوە بـی، ئەگەر تەقوات هـەبی تەزکیـەت دەبـێ، وە هـەر کـات نەفـست تەزکیە بوو ڕەوشـتت بەرزو جوان دەبێ، کـاتێکیش تـەقوات دەبـێ عیبادەتـت هـەبێ، وە کـاتێکیش عیبادەتـت دەبـێ کـە ئیمـان و

عەقیدەیەکی باشت هەبێ و لەوێوە دەبێ دەست پێ بکەین، بۆیە زۆر شتێکی هەڵەیە ئێمە چاوەڕوانی یەکمان لە خۆمان هەبێ- بۆ نموونە لە ڕووی عیبادەتەوە ئازا بین- بەبێ ئەوەی کە ئیمان و عەقیدەیەکی باشمان هەبێ، جاری وایە ئینسان هەرچەند دەکا خۆی پێ ڕانایێ لەسەر شەونوێژ یان لەسەر ڕۆژووی سوننەت یان لەسەر قورئان خوێندن، یان لەسەر هەندێك زیکرو ویرد تەمبەڵی دەکات و بەدەنی بۆی هەڵناسووڕێ، جا لەو کاتەدا دەبێ چاو بە ئیمانەکەی دا بگێڕێتەوە، ئەگەر لە عیبادەت سست بووی بزانە خەلەل لە ئیمانتدا هەیە، وە ئەگەر تەقواو تەزکیەت وەك پێویست نەبوو بزانە خەلەل لە عیبادەتدا هەیە، هەر کات ڕەوشتت وەك پێویست نەبوو، دیارە خەلەل لەو شتانەی پێشەوە دایەو دەبێ لە پێشەوە بە چاکی بیهێنی جا ئەگەر بناغەکەت تەواو بوو دیوارەکەشت دەگونجێ کە ڕێك و ڕاست دەربچێ.

## ٤- زانیاری و شارەزایی هەبوون بە ئیسلام و ئەو واقیعەی کە تێیدا دەژین:

هۆکارێکی دیکەی چوارەم: کە ئێمە وا لێدەکات ببینە پێشەنگ و ببینە سەرقافڵە بۆ خەڵك ئەوەیە کە (زانیاری و شارەزایی)مان هەبێ، دیارە دەگونجێ زانیاری و شارەزایی پێش ئەوانی دیکەش بکەوێ بەڵام بە هەرحاڵ لێرەدا ئاوامان داناوە، وە مەبەستم لە زانیاری و شارەزایی دوو شتە، یەکەم: لە دینی خوادا

زانیاری مان هەبێ، دووەم: لەو واقیعەدا کە تێیدا دەژین شارەزایی مان هەبێ، چونکە خوای پەروەردگار بە دوو سیفەت خۆی مەدح دەکات، کە دیارە لە یەك جیان، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ (لقمان ٣٤) ، ﴿ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾ (النساء ٣٥)، علیم: واتە زانایە بە شتەکان، خبیر: واتە شارەزایە بە شەخصەکان، چونکە، (خِبرة) بریتیە لە شارەزایی بە کەسەکان (أشخاص)، بەلاَم (عِلْم) بریتیە لە زانیاری دەربارەی شتەکان (الأشیاء)، ئێمە پێویستە دەربارەی ئیسلام زانا بین، چونکە کاتێك دەتوانین ببینە پێشەنگ بۆ خەڵك، کە ئەو دینەی خەڵکی بۆ بانگ دەکەین لێی شارەزا بین، وە کاتێکیش دەتوانین لەو کۆمەڵگاو دەوروبەرەدا کاری ڕاست و دروست بکەین، کە پێی ئاشنا بین پێی شارەزا بین، زۆرجار برایانی خۆشەویستم تەماشای دەکەی مسوڵمانێك زانیاری هەیە دەربارەی ئیسلام، ئایەتی لەبەرن و فەرمایشتی پێغەمبەری ﷺ لەبەرن، بەلاَم شارەزا نیە بەو واقیعەی کە تێیدا دەژی، بۆیە دەبینین ئیشەکەی نارێك دەردەچێ، بەڵکو جاری وا هەیە قسەیەك دەکات و ئیشێك دەکات زەرەری لە قازانجی زیاترە، لەبەرئەوە نا کە لە ئیسلام دا زانیاری نیە، بەڵکو لەبەرئەوە کە دەربارەی ئەو واقیعە کە تێیدا دەژی شارەزا نیەو (خِبرة)ی نیە!

## ٥- هەبوونی نەخشە بۆ ئیش و کار :

هۆکاری پێنجەم: ئەوەیە کە ئێمە (دەبێ هەمیشە نەخشەمان هەبێ بۆ ئیش و کارمان)چونکە ئەگەر بمانەوێت لە واقیعێك دا کار بکەین و ئامانجێك بهێنینە دی بە تەئکید بەبێ نەخشە بۆمان ناکرێت، وە ئەگەر تەماشای ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکەین ئایا بە بێ نەخشە کاری کردوە؟! بە تەئکید نەخێر، تەماشا دەکەین ئەو کاتە کە خەریکی هەوڵدان بووە بۆ ئەوەی کە شاری مەککە جێ بهێڵێ و پێگەیەکی دیکە بۆ کاری خۆی دروست بکات و بنکەیەکی جەماوەریی بۆ بانگەوازەکەی خۆی دروست بکات، لەگەڵ سەرۆك و عەشیرەتەکان دا کە قسەی کردوە چۆنی قسە کردوە؟! فەرموویەتی: (( مَنْ يؤيني مَنْ يَنْصرني حتى أُبلّغ عن ربّي)) کێ پەنام دەدات کێ پشتم دەگرێ تاکو دینی خوا ڕابگەیەنم؟! جا جاری وا هەبووە یەکێك لەو سەرۆك عەشیرەتانە کە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) داوای لێکردوون پەنای بدەن و هاوکاری بکەن و پشتی بگرن پێیان گوتوە: باشە بانگەواز بۆچی دەکەی؟! جا کە تێی گەیاندوون جاری وا بووە هەر لە ئەوەڵەوە ڕێك نەکەوتوون، جاریواش بووە گوتوویانە، وەڵڵا شتەکانت زۆر باشن بەڵام وەرە با سەوداو مامەڵەی تێدا بکەین: ئایا لە دوای خۆت ئەو کارە بە دەست کێوە دەبێت وەرە ئەگەر بۆمان مۆر دەکەی و دەسەلمێنی کە

لە دوای تۆ دەستەڵات بۆ ئێمە بێ، بۆ عەشیرەتی ئێمە بێ ئەوە باشە ئامادەین، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی نەخێر ناتوانم ئەو بەڵێنەتان پێ بدەم، چونکە ئەوە عایدی خوایە و بە دەست من نیە کە بتاندەمێ یان نەتاندەمێ، بۆچی وای فەرمووە؟! چونکە بە نەخشە کاری کردوەو دووربین بووەو لەگەڵ خۆی و لەگەڵ خواو لەگەڵ خەڵك دا ڕاست بووەو ناگونجێ ئێستا شتێك بە خەڵکی بڵێی سبەینێ شتێکی دیکەیان پێ بڵێی، ناگونجێ ئێستا بڵێی باشە زۆر چاکە لە دوای خۆم ئێوە سەرپەرشتی ئەو کارە بکەن هەر بۆ ئەوەی مەداری ئێستات ساز بکەی و دەربەست نەبی بەیانی چی ڕوو دەدات!

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە سەرەتاوە فەرموویەتی: ئەوە هی من نیە هەتا بیدەم بە ئێوە بەڵکو هی خوایە، هی خوایە بەو مانایەی کە بە پێی شەرعی خوا دوایی بەرپرس و سەرپەرشتی ئەو کارە دیاری دەکرێت و مسوڵمانان بە ڕاوێژی نێو خۆیان کە شەرعی خوا فەرمانی پێکردوە ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتی یە بە کەسی شایستەی خۆی دەسپێرن!

کەواتە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەر لە سەرەتاوە بە بەرچاو ڕوونی و بە نەخشەوە کاری کردوەو لەسەر پلان و نەخشە کاری کردوەو ئەوە نەبووە کە هەر لەخۆوە مل لێنێ، جا ئێمەش دەبێ وابین چونکە ئەم ژیانە دنیایی یە جێگای تێدا بەڕێوەچوونی

هۆیەکان (أسباب)ە و هیچ ئامانجێك بــە بــێ هۆکــار و وەســـیلەی تایبەتی خۆی نایەتەدی! ئەوەتا خوای کاربەجێ (تبارك وتعالى) کە باسی بەسەرهاتی (ذو القــرنين) دەکات کە یەکێکە لەو عەبدانــەی کە خوای پەروەردگار لــە مــەقامی مــەدح و پەســەندی دەربڕینــدا باسی دەکات دەفەرموێ ﴿ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَـاهُ مِـن كُـلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴾ (الكهف ٨٤) واتە: ئێمە پێی ئەومان چەســپاند بوو لە زەویدا و دەسەڵات مان پێ دابوو، چۆن؟! ﴿ وَآتَيْنَـاهُ مِـن كُـلِّ شَـيْءٍ سَبَبًا ﴾ (الكهف ٨٤) بۆ هەرشتێك بۆ هێنانەدی هەر ئامانجێك ئێمــە هۆکارمان بۆ ڕەخساندبوون لە ڕێی سروشتی و ئاســایی یــەوە بــۆ شتەکان دەچوو، بە گوێرەی یاساکان (سنن)ی خوا (عزّوجل) بــەرەو ئامانجەکان هەنگاوی دەنا.

کەواتە: ئێمــەش لــە بــواری کاروچــالاکی ئیــسلامیمان و هــەر کارێکی دیکەش دا، دەبێ وابین و هەموو شتێکمان بە نەخشە بــێ، کە بەڕاستی زۆر جاران کاری ئیــســلامیی ئــەو لایەنــەی ناتــەواوو کرچ و کاڵەو ئەگەر سەرنج بدەین بە زۆری هەروا بووە بــە تایبــەتی لە ساڵانی ڕابردوودا چ لــە کوردســتان و عێــراق لــە شــوێنەکانی دیکەش دا کاری ئیسلامیی بە زۆری کاردانەوە بووە، ئێمە هەر لــە شوێنی خۆمان بووین تا خەڵکێك شتێکی کردوە، ئەو کاتە ئێمەش لە کاردانەوەدا شتێکی دیکەمان کردوە! کە بێگومان ئەوە غەڵەتەو کاری ئیسلامی،دەبی، (کار) بێ نەك (کاردانەوە).تــۆی ئیــسلامیی

دەبێ نەخشەی خۆتت هەبێ، بەرنامەی خۆتت هەبێ، ئامانجی خۆتت هەبێ، وە دەبێ بەو نەخشەیەی خۆتداو بە پێی ئەو بەرنامەی خۆت بەرەو ئەو ئامانجانەی خۆت حەرەکەت بکەی بجولێی، نەك خەڵك بتجوولێنێ و کارەکانت و جم و جۆڵ و چالاکی یەکانت بریتی بن لە کاردانەوە بۆ کاری خەڵکی دیکە!

## ٦- کاروبار بەڕێوەبردن بە پێی هەردوو بنەمای: ڕاوێژپێکردن و گوێگرتن و بەقسەکردن :

هۆکاری شەشەم: بۆ ئەوەی کە لایەنێکی ئیسلامی ببێتە پێشەنگ و سەرقافڵە، ببێتە ڕێگە شکێن ئەوەیە، کە (کاروباریان لەسەر هەردووك پایەی ڕاوێژپێکردن (المشاورة)و گوێگرتن و بە قسەکردن (السمع والطاعة)بنیات بنێن)، ڕاوێژو پرس و ڕا پێکردنی قیادە بە قاعیدەو، گوێ بۆ گرتن و فەرمانبەریی بۆ کردنی قاعیدە بۆ قیادە، چونکە خوای کاربەجێ کاروبار هەڵسوڕاندنی مسوڵمانانی بە گشتی بەوە وەسف کردوە کە بە ڕاوێژە: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾(الشورى ٣٨)، هەروەها فەرمانیشی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە، کە ڕاوێژ بە هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ، بکات: ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ (آل عمران ١٥٩) دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم

فەرمانەی وەك هەر فەرمانێكی دیكەی خوا (عزّوجل) بە چاكترین شێوە جێبەجێ كردوە، وەك یەكێك لە هاوەڵان، لەو بارەوە گوتوویەتی(ما كان أحد أكثر مشورة بأصحابه من رسول الله ﷺ) (رواه البخاري) واتە: هیچكەس هێندەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە هاوەڵانی نەكردوە.

دیارە ئەگەر لەسەر پێغەمبەری خواش ﷺ پێویست بێ ڕاوێژ بە هاوەڵانی بكات بۆ كاروبارییان، لەسەر غەیری وی پێویستت ترەو غەیری وی زیاتریان پێویستە. چونكە ئاشكرایە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو ڕوویێكەوە بە تواناترو لێهاتووترە لە غەیری خۆی! ئینجا شایانی باسیشە كە مەبەست لە قیادە تەنیا كەسی یەكەم (ئەمیر) نیە، بەڵكو هەر كەسێكە كە دوو كەس و زیاتری لەبەردەستە لە هەر بوارێكداو بۆ هەر ئیشوكارێك، تەنانەت سێ كەسی ڕێبواریش لە سەفەردا وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إذا خرج ثلاثة في سَفرٍ فليؤمِّروا أحدهم)) (رواه أبوداود)، واتە: هەر كات سێ كەس بە سەفەر چوون با یەكێكیان بكەنە برا گەورەیان.

دیارە فەلسەفەو حیكمەتی ڕاوێژكردن و ڕاوێژپێكردنیش ئەوەیە كە مسوڵمانان لە هەموو بوارەكانی ژیانیان داو بۆ سەرجەم كاروبارەكانیان كام شتە ڕاست ترو چاكترو لە هەق و دادو بەرژەوەندییەوە نزیكترە ئەوە هەڵبژێرن و لە هەڵەو پەڵەو شتی

نارێکوپێك و بێ سەرەوبەرە دوورین.

شایانی باسیشە کە ڕاوێژو ڕاوێژکاریی لە ژیانی مسولڵمانان دا تایبەت نیە بە لایەنێك و دووانەوە وەك لایەنی سیاسی، بەڵکو بناغەی کاروبار بەڕێوەبردن و هەڵسووڕاندنە بە گشتی و بەبێ هەڵاواردن (إستثناء). چونکە وشەی (أمرهم) لە ئایەتەکەی سوورەتی (الشوری)داو وشەی (الأمر) لە ئایەتەکەی سوورەتی (آل عمران)دا چەمك و واتاکەیان گشتگیرو فراوانەو هەموو جۆرە کاروبارێك دەگرێتەوە.

بەڵێ بەڕێزان، مەسەلەی ڕاوێژو پرس و ڕاوێژ بە یەکترکردن شتێکی زۆر ڕیشەیی و بنەڕەتی یە لە ژیانی مسولڵماناندا لە ژیانی تاکیی یان خێزانیی یان کۆمەڵایەتیی یان سیاسیی یان ئابووریی یان فەرهەنگیی یان ... هتد داو لە هەموو ئاستەکان دا، بەڵام وەك لەسەر قیادە پێویستە پرس بە ئەندامانی بکات و ڕاوێژیان پێ بکات و ئیستیفادە لە عەقڵ و بۆچوون و ئەزموونیان بکات، لەسەر قاعیدەش، لەسەر خەڵکەکەش پێویستە بە قسەی قیادەی خۆیان بکەن، جا شەرع دوو وشەی بۆ ئەو مەبەستە بەکارهێناون، (السمع والطاعة) گوێ بۆگرتن و فەرمانبەریی کردن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((علی المرء المسلم السمع والطاعة )) (متفق علیه) واتە: گوێ گرتن و بە قسەکردن لەسەر بابای مسولڵمان پێویستە.

دیاره به قسەکردن (الطاعة) بەبێ گوێگرتن (السمع) نابێ و گوێ بۆ گرتن (سمع)یش ئەگەر فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی (الطاعة)ی به دوادا نەیەت، هیچ نیه.

هەڵبەته بۆیەش گوێ گرتن (السمع)، پێش خراوه چونکه (به قسەکردن) ئەگەر تێی نەگەی فەرمانەکه چیەو لێی حاڵی نەبی داخوا ڕاسته، شەرعییه شەرعی نیه، چاکه یان خراپه، هەر له خۆوه بەدوا بکەوی ئەوه شوێنکەوتنی کوێرانەیه، به کەڵك نایەت و له ئیسلام دا شتی وا نیه، بەڵکو له ئیسلام دا قاعیده دەبێ به قسەی قیاده بکات، بەلاَم به بەرچاو ڕوونی یەوەو له سنووری شەرعدا، تەنانەت پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) که به تەئکید هیچ شتێکی نەفەرمووه پێچەوانەی هەق و ڕاستی بێ لەگەڵ ئەوەش دا خوای پەروەردگار به قسەکردنی ئافرەتانی مسوڵمانی بۆ پێغەمبەری (علیه الصلاة والسلام) بەستۆتەوه به هەق و چاکەوه، وەك فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (الممتحنة ١٢)

ڕستەی : ﴿ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ ﴾ واته: له چاکەدا له قسەت دەرنەچن، جا ئایا پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)

ئەتۆ بڵێی غەیری چاکە بە خەڵك بڵێ؟!

بەڵام خوای پەروەردگــار ئەویشی بەستۆتەوە بــە (معـروف)ەوە ﴿ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ ﴾ !! جا ئەوە بۆ ئێمە دەبێتە عیبرەت کە هیچ سەرکردەیەك، هیچ برا گەورەیەك بۆی نیە ئەو چاوەڕوانی یــەی لە خەڵك و ئەندامە ژێردەستەکانی خۆی هــەبێ، کــە کوێرانــە بــە دوای بکەون وە لە هەموو شتێك دا هەر بڵێن: بــەڵێ و ســەری بــۆ بلەقێنن!!

لە ئیسلام دا شتی وا نیەو لە ئیسلام دا (بە قــسەکردن)، گــوێ بۆگرتنی لە پێشەوەیە، (السمع والطاعــة) (الــسمع) ئەوەیــە گــوێ بگری تێ ی بگەی و لەو فەرمانــە حــاڵی ببــی داخــۆ شــەرعی یــە ناشــەرعی یــە چــیەو چــۆنە! ئینجــا نــۆرەی (الطاعــة) دێ واتــە: بەقسەکردن و فەرمان بەریی بۆ کردن.

## ٧- پــــشوو درێــــژیی و خــــۆڕاگریی و کۆڵنــــەدان و نەوەستان:

هۆکاری حەوتەم بریتی یــە لــە پــشوو درێــژیی و خــۆڕاگریی و کۆڵنەدان و نەوەستان، (دیارە من لێرەدا تەنیا شــتە ســەرەکیەکانم باسکردوە ئەگەرنا دەگونجێ زۆر هۆکار باس بکرێن بۆ پێگەیاندن و خەملاندنی کۆمــەڵێك کــە ببنــە پێــشەنگ و ڕێگــا شــکێن و سەرقافڵە بۆ مسوڵمانان).

جا هۆكاری حەوتەمی پەیدابوون و پەروەردەبوونی ئەم كۆمەڵـە پێشەنگە ئەوەیە كە دەبێ ئەو كۆمەڵە خەڵكە پشوو درێـژ بێـت و باخەڵ فەراح بێ وە دەبێ خۆڕاگر بێ و دامەزراو و نەلەخـشاو بـێ، ئەگەرنا با ئەو شتانەی پێشێ هەمووشیان هەبن، بەڵام لەگـەڵ دوو گرفت و كێشەو نارەحەتی هاتە پێش پاشەكشە بكات، مانای وایـە هیچ، وە ئەو پاشەكشەیە مانای وایە كە لە ڕاستیدا ئـەو شـتانەی پێشێشی تەواو نین، چونكە بێگومان ئیمانی تەواو عیبادەتی چاك و ڕەوشتی بەرزو ئەوی دیكە ئـەوی دیكـە بـەدوای خـۆی دا دێنـێ و هـەموویان وەكـو ئاڵقـەكانی زنجیرێـك یـەكتر دەبەسـتنەوە، بـەڵام مەبەستم ئەوەیە كە ئێمە بەبێ پشوو درێـژیی و خـۆڕاگریی كـاری ئیسلامیمان بۆ ئەنجام نادرێ وە هەر كەسـێكیش چـاوەڕوانی ئـەوە بكات و پێی وابێ لەبەرئەوەی مسوڵمانین و خواناسین نابێ گرفت و كێشەو نارەحەتیمان بێتە ڕێ!! ئەوە مـانای وایە هەر لـــێی حـاڵی نەبووە چونكە هی وا هەیە بە تایبەتی لە خەڵكی عەوام پێی وایە مادام ئینسان چاك بوو، بە تەقوا بوو، بۆ خوا صوڵحاو بـوو، نابـێ تووشی كێـشەو گیروگرفـت بـێ و نابـێ تووشـی چەرمەسـەریی و نارەحەتی بێ، بۆچی ؟!

دەڵێن مادام دۆستی خوایەو صاڵح و چـاكەكارە، نابـێ تووشـی نارەحەتی بێ! بەڵام بێگومان ئەو جـۆرە تێـڕوانین و بیـركردنەوەیە ڕاست پێـچەوانەی سـیرەو ژیـانی پێغەمبەرانـە (علـیهم الـصلاة

والسلام) وه پێچەوانەی دەیـان ئایـەت و فەرمایـشتی پێغەمبـەرە (علیه الصلاة والسلام) نەك هەر خەڵکی عەوام بگرە ئێمە خۆشمان گەلێك جاران هەرچەندە بە شـێوەیەکی تیـۆری دەزانـین و دەڵـێین: مسوڵمانەتی و کاری ئیسـلامیی گرفتاریی و ناڕەحەتی و کۆسپ و تەگەرەی تێدایە، بەڵام کاتێك بە کردەوە دەکەوینـە نێـو دووچـاری لەرزین و لەقین و لەرەلەر دەبین!، مـن بینیومـە کـابرا لەگـەڵم دا بووەو پێکەوە بووین لە ناڕەحەتی و گرفتارییەکدا دوایـی تەماشـام کردوە لە قیوەو کەوتۆتە گومان: ئەتۆ بڵێی ڕێیەکـەمان غەڵـەت نەبێ؟ ئەتۆ بڵێی ئـەوە سـزای خـوایی نـەبێ؟! بـەڵێ بێگومـان ئینسان دەبێ هەمیشە نەفسی خۆی تاوانبار بکات، بەڵام نابێ ئـەو تاقیکردنەوەو گرفت و ناڕەحەتی یانەی کە دێنە ڕێت، لە حاڵێکـدا کە تۆ دڵنیای بە ڕێی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) دەڕۆی و هیچی ناشەرعیت نەکردوە، نابێ هەمووی بگێڕیەوە بۆ ئـەوەی کـە ڕەنگە من لام دابێ، بۆچی؟ چونکە ئەو بیرکردنەوەیـەت لـەوەوە دێ کە تۆ پێت وایە ئینـسان ئەگـەر بـۆ خـوا صـوڵحاو بـوو تووشـی ناڕەحەتی یان نابێ! دیارە لە هـیچ دەق (نـص)ێکـیش دا شـتی وا نەهاتوە، بەڵکو خوا (عزّوجل) لە چەندان ئایەت دا فەرموویـەتی: ئەگەر ئیماندار بن تووشـی تاقیکرانەوە(إبتلاء) دەبن و ئەگـەر بـۆ خوا صوڵحاوبن خوای پەروەردگار تاقیتـان دەکاتەوە، بەڵکو بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((یُبْتلـی المـرءُ علـی قَـدَر دینـه ...))

ئینسان پیاو یان ئافرەت، تـاکو بـۆ خـوا صـوڵحاوتر بـێ و هـەتا ئیمانی کامڵتر بێت و هەتا زیاتر ئەهلی تەقوا بێ و زیاتر لـە خـوا نزیك بێ، خوای کاربەجێ زیاتر تاقی دەکاتەوە وە ئیمتیحانەکەشـی قورستر و سەختتـر دەبێ، وەکو خوا بـەرز و بەبـەزەیی دەفـەرموێ: ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ أَذًى كَثِيرًا وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ﴾ (آل عمران ١٨٦) واتە: بە تەئکید تاقی دەکرێنـەوە لـە مـاڵ و سـامان و لـە نەفـسی خۆشـتاندا، ئاشکراشـە هـاوەڵانی پێغەمبەر خوا لێیان رازی بێ یەکـەمین دوێنـراو (مخاطـب)ی ئـەم ئایەتەن و خوا بە وانی فەرمووە: بە تەئکید تاقی دەکرێنەوە وە خوا تاقیشی کردنەوە، کێ بە قـەدەر هـاوەڵان (خـوا لێیـان رازی بـێ) نارەحەتی و گرفتاریی و دەردەسەریی بینیوە لە هـەموو شـێوەکان: نەداریی و هەژاریی، نارەحەت کران، پڕوپاگەندە بـۆ کـران، گـیران، دەرکران، برینـدارکران، کـوژران کەسـوکار کـوژران ترسـێندران، برسی کران، ڕووت و ڕەجاڵ کەوتن، قەرزدار بوون؟! بێگومـان کەس بە قەدەر هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی نـەبینیوەو هـیچ کەسیش لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر بە گشتی لـە خـوا نـزیکتر نەبووە لە دوای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

کەواتە: ئێمە دەبێ، یەکەم: عەزمان لەسەر ئەوە جـەزم بـێ کـە ئـەم ڕێ یـە -ڕێی دینـداریی و موسـڵمانەتی- تاقیکرانـەوەو

نارەحەتی و گرفتاریی تێدایە، دووەم: وە دەبێ دڵی خۆشمان لەسەر ئەوەی دابمەزرێنین کە خۆڕاگر بین و پاشەکشە نەکەین، ئنجا برایانی خۆشەویست، گەلێك جاران ئەو کەسەی کە خۆڕاگر دەبێ لەگەڵ ئەوەی کە صەبر ناگرێ، لەسەرەنجام دا جیاوازی یان نابێ، بۆ نموونە: دوو نەفەر بە زوڵم زیندانی دەکرێن یەکیان صەبر ناگرێ و دەڵێت: (من ئیسلامیی نیم !) یان دەڵێ: (ئامادەم ئیسلامیی نەبم) یان (بەڵێن دەدەم کە لەمەودوا کاری ئیسلامیی نەکەم)!

ئەوی دیکەشیان دەڵێ: (ئیسلامیم و قەناعەتم وابووە ئێستاش هەروام) ئەم دوانە مەرج نیە سەرەنجامەکەیان جیاواز بێ، بەڵکو ڕەنگە ئەوەیان کە دەڵێ: (واز دێنم) یان (من وازم هێناوە) جەندرمە بگرەکانی بڵێن ئەوە دەیەوێ فێڵمان لێ بکات و هەرچۆن بووە خۆی دەرباز بکات و دوایی زیانمان لێ بدات!

بەڵێ جاری وا بووە کە بابای بێهێز و پاشەکشەکەر مامەڵەی خراپتری لەگەڵ کراوە، ئنجا ئەو مەسەلەیە لە زۆر بواراندا هەروایە تەنانەت لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەش دا لە شەڕێدا خەڵکم بینیوە هێرشی بردوە سەلامەت بووە، هی واشم بینیوە ڕای کردوە کوژراوە! هەیە لە هێرش بردنێدا سەلامەت دەبێ، و لە ڕاکردنێدا فیشەکێکی وەپشتە ملێ دەکەوێ!

کەواتە: مەرج نیە ترسان و بێهێزی هەمیشە سەلامەتی بەدواوە

بێ و ئازایەتی و خۆڕاگریی بەڵاو موصیبەتی بەدواوە بێ، بەڵکو زۆرجار بە پێچەوانەوەیە .

مێژووزانی ناودار (ابن الأثیر) لە کتێبی (الکامل فی التأریخ)دا لە زمانی مسوڵمانێکەوە بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە دە کەس بووین لە ژێرخانێکدا خۆمان شاردبۆوە کابرایەکی تەتەری هات گوتی چی دەکەن لێرە؟! دەڵێ: گوتمان لە ترسی ئێوە خۆمان شاردۆتەوە، گوتی دەڕاوەستن هیچم پێ نیە سەرتانی پێ ببڕم هەتا دەچم چەقۆیەك، خەنجەرێك، تیغێك دێنم! دەڵێ: چوو شتێك بێنێ پێمان سەربڕێ، دەڵێ منیش گوتم: چاوەڕێی چی دەکەن؟ دەڵێ گوتیان: چاوەڕێی چی دەکەین؟ چاوەڕێین بێتەوە سەرەمان بۆ بگرێ و سەرمان بڕی و شایەتمان بێنین! دەڵێ: گوتم جا خۆ ئەو یەکێکەو ئێمە دە نەفەرین! گوتیان ئاخر ئەو تەتەرییەو پێی ناوێرین!! دەڵێ هەر چۆنێکی بێ یەك دوویکم لێ قەناعەت پێ هێنان کە دەست بکەنەوە، دەڵێ گوتم ئەگەر هاتەوە دوو سێ یەکمان خۆی پێدا دەدەین، بە هەر حاڵ دەڵێ کابرا هات و خەریك بوو سەرەمان بۆ ڕاگرێ و لە سەرەوە پێ دابێ و سەرمان ببڕێ، بەڵام خۆمان پێداداو بە چەقۆیەکەی خۆی سەرمان بڕی!

کەواتە: دەستکردنەوەو خۆ پێدادان هەموویانی سەلامەت کردوەو، بێگومان ترسنۆکیش هەموویانی بە سەربڕین دەدا!

کەواتە برایانی خۆشەویست! با ئێمە نە لەو حەددەی کە شەرع

دەڵێ تێپەڕێنین و نە لەوەش کە شەرع دەڵێ کورتی بێنین، شەریعەتیش هەمیشە فەرمان دەکات بە خۆڕاگریی و پشوو درێژیی و ڕاوەستاویی و دامەزراویی و نەلەخشاویی، ئنجا ئایا کێ واقیعی بۆ دەگۆڕدرێ؟! بێگومان کەسانێك کە بتوانن لەبەردەم ئەو واقیعەدا هەڵوەستە بکەن و بوەستن و بەرەنگاری ببنەوە، ئەگەرنا ئەوانەی کە تەسلیمی واقیع دەبن، دەبنە بەشێك لەو واقیعە! زۆرجار لایەنێکی ئیسلامی کە بە هەر تەئویل و پاساوێکەوە بێ تەسلیم بە واقیع دەبێ، دەبێتە بەشێك لەو واقیعە خراپەو تەواو دەبێ، ئنجا ئایا ئێمە چۆن دەتوانین واقیع بگۆڕین ئەگەر صەبرمان نەبێ و ئەگەر تەحەممولێ ناڕەحەتییەکان نەکەین و خۆڕاگر نەبین و ئیستقامەتمان نەبێ، ئیستقامەتیش ئەوەیە کە تۆ ڕاوەستاو بی لەسەر جادەی شەریعەت نەك هەر ڕۆژە هەندێکی لێ کەم بکەیەوەو هەر ڕۆژە هەندێکی لێ بشاریەوەو هەر ڕۆژە هەندێکی لێ ژێر لێو بخەی بۆ ئەوەی خەڵك لێت ڕازی بێت ، بێگومان کاری ئیسلامیی بەو جۆرە سەری لە هیچەوە دەردەچێت .

## تەوەرەی دووەم

# بنکـەی جەمـــاوەریی

برایـــانی خۆشەویـــستم! هـــەرکات ئێمـــە توانیمـــان ببینـــە پێشەنگێکی ئیـــسلامیی بـــە تەئکیـــد پێـــشەنگێکی ئیـــسلامییش مەگەر چۆن ئەگەرنا دەتوانـــێ بنکەیـــەکی جـــەماوەرییش دروســـت بکات، چـــونکە کۆمـــەڵێك، خـــەڵکێك کـــە دەبـــن بـــە پێـــشەنگ و سەرقافڵە بۆ خەڵك و میللەت و کۆمەڵگاکـــەی خۆیـــان، وردە وردە ئەو کۆمەڵگایە لەگەڵ خۆیان هاوڕەنگ دەکـــەن، جـــا مـــن ئێـــستا باسی ئەوە دەکەم چۆن ئێمە دەتوانین خەڵك لەگەڵ خۆمان هاوڕەنگ و هاودەنگ بکەین، چۆن دەتوانین ببینە تەوژم، چـــونکە دەبـــێ دڵنیـــا بین هەر کاتێك لایەنێکی ئیسلامی تەنیا هەڵبژاردەیەك (نخبة) بوو بە ئاسانی لە بەین دەبرێ، وە قەتیش واقیعی پێ نـــاگۆڕدرێ، بۆیـــە دەبێ هەمیشە هەوڵ بدرێ کە کارو جم و جۆڵی ئیـــسلامیی ببێتـــە تەوژم، بەڵێ کاری ئیسلامیی بە (نوخبة) دەست پێ دەکـــات بـــەڵام دوایی دەبێ ببێتە تەوژم و بنکـــەی جـــەماوەریی بـــۆ خـــۆی دروســـت بکات و ڕای گشتی بۆ خۆی دروست بکات و خەڵك لەگەڵ خۆی دا هاوڕەنگ و هاودەنگ بکات، جا ئایا ئەوە چۆن و بە چـــی دەکـــرێ؟! ئەوە بابەتی ئەم تەوەرە دووەمەی وتارەکەمەو تۆزیکی دیکە دێینـــە

سەری، بەڵام ئەوەی بە پێویستی دەزانم کە جارێکی دیکەش جەختی لەسەر بکەمەوە، ئەو ڕاستی یەیە کـە کـارو چـالاکی ئیـسلامیی بەبێ ئەوە واقیعی پێ ناگۆڕێ، بـەڵێ دەگـوترێ، فـلان کۆمـەڵ و لایەنە ئیسـلامیی یە خەڵکی پاك و پوخت و چاكن، بەڵام هەر بـۆ خۆیان چاكن، گرنگ ئەوەیـە ئێمـە چـۆن دەتـوانین خـەڵك لەگـەڵ خۆمان دا هاوڕەنگ و هاودەنگ بکەین و خۆمان و کارە ئیـسلامی یەکەمان بکەینە ڕایەکی گشتی و تەوژمێکی کاریگەر؟! من لـەو بارەوە حەوت هۆکارم دیاری کردوون:

## یەکـەم: بەرچـاو ڕوونیـی و دڵنیـایی دەربارەی ڕێبـازو بـەرنـامــە:

ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەران (علیهم الـصلاة والـسلام) بکەین، دەبینین بەردەوام لە سـەرەتای قـسەکانیانەوە فەرمووویانـە: ﴿ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّـيَ ﴾[1] بـەر لـە هـەموو شتێك ئینسـان دەبـێ لەسـەر (بَيِّنَـــة) و (بـصيرة)بـێ، دوای ئـەوە ئەوجار دەست بەکاربێ، پێشـێ دەبێ بۆ خۆت بزانی خەڵك بۆ کوێ بانگ دەکەی و بۆ چی یان بانگ دەکەی؟!

بۆیە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ

(١) بڕوانە: سووڕەتی (هود) ئایەتی(٢٨، ٦٣، ٨٨)، کە هەر کام لە:(نوح و صالح و شعیب) (علیهم الصلاه والسلام) ئەوەیان فەرمووە .

لَا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ ...﴾ (محمد ١٩) پێشــێ فــەرمانی پــێ دەکات بەوە کە زانیاری هەبێ بەوە کە بێجگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نین، ئنجا فەرمانی پێ دەکات بە داوای لــێبوردن کــردن لــە خوا، هــەروەها لــە ســـوورەتی (یوســف)دا خــوا (جــلّ شــأنه) بــە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُـو إِلَـى اللّـهِ عَلَـى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَـاْ مِـنَ الْمُـشْرِكِينَ ﴾ (یوسـف ١٠٨) واتە: بڵێ ئا ئەمە رێبازی منە لەبەر رۆشناییدا بانگ دەکەم بۆ لای خوا خۆم و ئەوانەی شوێنم کەوتوون، وە من لە هاوبەش بــۆ خوا دانەران نیم.

ئنجا ئایا لەسەر بەڵگەو لەسەر رۆشنایی بوون یانی چی؟! یانی تاك تاکی ئێمە کە دەمانەوێ کاری ئیسلامیی بکەین پێشێ دەبــێ لــەو دینــەی خۆمــان دا چــاك شــارەزا بــین پاشــان لــە راســتیی و تەواویشی دڵنیا بین، چــونکە ئــەو پێغەمبەرانــە (علــیهم الـصلاة والسلام) کە فەرموویانە: ﴿ يَا قَوْمِ أَرَأَيْـتُمْ إِن كُنـتُ عَلَـى بَيِّنَـةٍ مِّـن رَّبِّـيَ ﴾ (بیّنة) یانی: بەڵگەی روون و ئاشــکرا، کەواتە: پێویــستە لە دینەکەت زاناو شارەزا بی، وە دەبێ لێشی دڵنیا بی، جا ئەگــەر وا بــووی ئــەوە هــەرگیز ناشــڵەژێی و بــە پڕۆپاگەندەیــەك، بــە هەڕەشەیەك بە ترس و تەماعێك بە تۆمــەت و گومانێــك تووشــی لەقین و لەرزین نابی و هەمیشە راوەســتاوو دامــەزراوو نەلەخــشاو دەبی. دیارە هەر کەسێکیش بــە دڵنیاییــەوە باســی رێبــازی خــۆی

نەکات خەڵکی گوێی بۆ ناگرن یاخود ئەوانیش بە دڵنیایی یەوە گوێی بۆ ناگرن، هی وا هەیە کە باسی ئیسلام دەکا وای باس دەکات کە لە ڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤکردەکانی نزیك بخاتەوەو وای دەخاتە ڕوو کە لەگەڵ دیموکراسی و جیهانگیریی و لیبرالیزم و تەنانەت سیکۆلاریزمیش‌دا جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە!!

بەڵام بێگومان ئەو ڕەفتارە وێڕای هەڵەیی و ناشەرعیی بوونی لە خودی خۆیدا، لە ڕووی بەرهەم و ئەنجامیشەوە هەر هەڵەیەو سەودایەکی دۆڕاوە!

بەڵێ هەندێك خاڵی بە یەك گەیشتن لە نێوان ئیسلام و هەندێك لە ڕێچکەو بیردۆزەکاندا هەن، بەڵام بە تەئکید زۆریش جیاوازن، بۆ وێنە، دیموکراسی هەرچەندە کۆمەڵێك بنەمای تێدان لەگەڵ شەریعەت دا کۆکن، بەڵام دیسان شتی واشی تێدایە کە هەر کەسێك ڕیشی خۆی لە مست بنێ سەری بە ئەنجامی خراپ دەگات وەك لە واقیع دا دەیبینین!!

بەڵێ، ئێمە مەدحی ئیسلام ناکەین ئەگەر بڵێین: ئیسلام و دیموکراسی یەکن بەڵکو لە ڕاستی دا زەمی ئیسلام دەکەین و مەدحی دیموکراسی دەکەین!

ئنجا ئەگەر گریمان هەندێك لە خەڵکیش بۆی هەزم نەکرێ، گرنگ نیە ئەگەر ئەمڕۆ تێی ناگەن گرنگ ئەوەیە هەق چۆنە ئاوا بخرێتە بەرچاویان، ئەمڕۆ نا سبەینێ تێی دەگەن!

چونكه هەر ئەو جۆرە كەسانە بوون كە دوێنێ دەیانگوت، ڕێباز تەنها ڕێبازی ماركسیزم و سۆسیالزمی علیمی و كۆمۆنیزمەو، تاك و كۆمەڵ تەنیاو تەنیا بەو بەرنامەو ڕێیەدا بەختەوەر دەبێ و، هەر بەوێدا كۆمەڵگایەكی ڕێك و ڕاست و دروست دەبێ!! كەچی ئەمڕۆ هەزار لەعنەتی لێ دەكەن!!.

ئەمڕۆش دەڵێن: نەخێر ئینسان دەبێ ڕوو لە سەرمایەداریی بكات و ڕوو لە دیموكراسی و لیبڕالیزم و سیكۆلاریزم بكات و، ڕێیەكانی دیكە هەموویان لارو خوارو هەڵەن، بەڵام دڵنیام سبەینێ نەفرین لەوەی ئێستاش دەكەن!

بەڵێ ئەگەر گوتمان ئیسلام دیموكراسییە، مانای وایە چارەنووسی ئیسلاممان لەگەڵ دیموكراسیدا لێك بەستوەو، هەر كات دیموكراسی بەڵایەكی بەسەر هات بەسەر ئیسلامیش دێ!

وەك چۆن ئەگەر دوێنێ گوتبامان ئیسلام سۆشیالیزم (إشتراكیة)ە، ئێستا كاتێك كە بلووكی سۆشیالیزم هەرەسی دەهێناو لە یەك هەڵدەوەشا، دەیانگوت دیارە ئیسلامیشی لەگەڵ لێك هەڵوەشاوە!!

بۆیە با ئێمە متمانەمان هەبێ بە دینی خوای كاربەجێ وەبا دینی خوای باڵادەست و دادگەر نەهێنین و بەو بەژن و باڵای بەرزو كەڵەگەتییەوە لەگەڵ بەژنی كورتە باڵای ئەو ڕێچكەو بیردۆزانە پێكی نەگرین و بەراوردی پێ نەكەین!

وه من پێشم وایه ئەو ڕەوته فیکریی یه دوو هۆکاری له پشتەوەن:

یەکەم: نەشارەزایی دەربارەی ئیسلام و تێدا بەرچاو ڕوون نەبوون و لێ دڵنیا نەبوونی.

دووەم: ئیمان لاوازیی و کەم له خوا (سبحانه وتعالى) و ئایین و بەرنامەکەی ڕابینین.

دیاره بەرهەمی ڕاستەوخۆی ئەو دوو هۆکارەش بریتییه له (کەوتنه ژێر کاریگەریی) ئەو تەوژم و بیروڕا سیکۆلاریسته دژ به ئیسلامەی که ئێستا له ئارادا هەیه.

بەڵام وەك دواییش باس دەکەین دەبێ وریا بین و تووشی دەردی بێ ئینصافیش نەبین، خەڵك ئەگەر شتێکی باشی هەبێ دەبێ بڵێین: ئەو شتەت باشه، کابرایەك به ناوی (أشجّ عبدالقيس) وەك له (صحيح)ی (مسلم)دا هاتۆته لای پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) کابرا سەرۆك عەشیرەتێك بوو کافر بوو هاتبوو مسوڵمان بێ، جارێ مسوڵمان نەبوو بوو پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) پێی فەرموو: (( إنَ فيكَ خَصلَتين يُحِبُّها الله وَرَسوله: الحِلمُ والأناة )) واته: بێگومان تۆ دوو سیفەتت تێدان که خواو پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشیان دەوێن: هێدیی و مەندیی و پەلەپەل نەکردن.

له ڕیوایەتێکدا هاتوه که ئەویش گوتوویەتی: ئایا ئەو دوو

سیفەتە بۆ خۆم پەیدام کردوون‌و لە خۆمـدا هێناومنـە دی یـاخود خوا بۆ خۆی منی لەسەر سروشتاندوون؟

فەرموویەتی: خوا (عزَّوجلّ) ئەو دوو سیفەتەی لە تـۆدا پەیـدا کردوون، ئـەویش گوتوویـەتی سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی کـە دوو سیفەتی تێدا پەیدا کردووم خواو پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێن.

کەواتە: با ئێمەش هەر کات حەقێك‌و چاکەیەکمان لە کەسێکدا بینی، با بڵێین: ئەوەت باشە، بۆ وێنە: دیموکراسی کۆمەڵێك شـتی باشی تێدان با بە باشەکانی بڵێین باشە، بەڵام با ئەوە وامـان لـێ نەکات چـاو لـە خراپەکانیـشی بپۆشـین، وە واشمـان لـێ نـەکات ئیسلامی تێرو تەواوی خوای کاربەجێ لەگەڵ شتێك کە زادەی بـیرو هۆشی ئینسانێك یاخود کۆمەڵە ئینـسانێکە پێکـەوە بـەراوردیان بکەین وە چارەنووسیان پێکەوە لێك ببەستین.

بەڵێ تەنیا کەسانێك کاری ئیسلامیی یان پێ دەکرێتە تـەوژم و خەڵك و کۆمەڵگایان پێ لەگەڵ هاوڕەنگ و هاودەنگ دەکـرێ کـە خۆیان لە بارەی ئیسلامەوە لەسەر (بیِّنـة)و (بصیرة)بن، واتە بـاش باش تێیدا بەرچاو ڕوون و شارەزابن و لێی پشـت ئەسـتوورو دڵنیـا بن، کەواتە: بەردی بناغەو هـەنگاوی یەکـەمان بـۆ دروسـتکردنی بنکەی جەماوەریی ئەوەیە کە پڕ بەدڵ شانازی بە بەرنامەو ئـایینی خۆمانەوە (کە ئیسلامە) بکـەین و پێمـان لـە هـەموو بەرنامـەو ڕێبازێکی دیکە ڕاست و چاکتر بێ بـە تەئکیـدیش هـەر کەسـێك

مسولْمان بێ دەبێ دینی خوای پێ لە هەموو شتێك چاكترو ڕاستتر بێ، بەڵكو دەبێ هەر دینی خوای پێ چاك و ڕاست بێ، بەڵێ بەرنامەی دیكەش هەیە كە هێندێك لایەنی باش باشی تێدایە، بەڵام دینی خوا ئەو شتە باشانەی بە شێوەیەكی باشتر تێدایە و لایەنە خراپەكانی ئەو بەرنامانەشی تێدا نیە.

دیارە لێرەدا دەرفەت نیە بیخەینە ڕوو ئەگەرنا ئیسپاتمان دەكرد كە ئیسلام لایەنە ئیجابی و چاكەكانی هەر كام لە: دیموكڕاسی و لیبڕالیزم و كاپیتالیزم و سۆسیالیزمی تێدایەو لە خاڵە بێهێزو سەلبی یەكانیشیان دوور و بەری یە.

## دووەم: تێگەیاندنی خەڵك لە بنەڕەتەكانی ئیسلام:

مەبەست لە تێگەیاندنی خەڵك لە بنەڕەتەكانی ئیسلام ئەوەیە كە ئێمە خەڵك لە پایە گەورەو گرنگ و بنەڕەتەكانی ئیسلام تێبگەیەنین، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە كوێوە دەستیان پێ كردوە؟ فەرمووڕیانە ﴿ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ ﴾[1]، ئەی گەلەكەم خوا بپەرستن بێجگە لە خوا پەرستراوێكی دیكەتان نیە، ئێمە نابێ هەرگیز لە خستنەڕووی خوا بەیەكگرتن (التوحيد) ماندوو بین، ئێستا تۆ بچۆ باسی

---

(١) بڕوانە: سورەتی (الأعراف) ئایەتەكانی (٥٩،٦٥،٧٣،٨٥) لەسەر زمانی هەركام لە نوح، هود، صالح، شوعەیب (علیهم السلام).

تەنها خواپەرستران بۆ خـەڵك بكـە پێـت دەڵـێن: جـا خـۆ خـەڵك خواپەرست و مسـوڵمانە، ئەوە نیە نوێژو ڕۆژوویان هەیـەو... هتـد. بـەڵام نـەخێر لەڕاسـتیدا زۆربـەی خـەڵك حـاڵی نیـە لـە تـەنیا خواپەرستن و خـوا بـە یـەكگرتن، هـەر بۆیـەش گـیرۆدەی لادان و هاوبەش بۆ خوا دانان و شوێنكەوتنی ڕێچكەو بـیردۆزە طـاغـوتی یەكان دەبـن، ئنجـا دیـارە كاتێـك پێغەمبـەران (علـیهم الـصلاة والسلام) بە گەل و كۆمەڵگاكانی خۆیانیان فـەرمووە: تـەنیا خـوا بپەرستن! خۆ ئـەوان خۆشیان بـە خواپەرسـت زانیـوە. بـۆ وێنـە: قورەیشی یەكان حەجیان كردوەو طـــەوافیان كـردوە، بـەڵام دیـارە گیرۆدەش بوون بە شـیركیـشەوە، دیـارە شـیرك جـۆری زۆرە، ئەگـەر وەختـی خـۆی دارو بـەرد پەرســترا بـێ، ئـەوە ئێـستا مۆدیـل دەپەرسـترێ، پارە دەپەرسـترێ، حیـزب دەپەرســترێ، ڕژێمـی زاڵـم دەپەرسترێ، شەخص دەپەرسترێ، هەواو ئارەزوو دەپەرسـترێ، ئێـستا زۆر شت دەپەرسترێ!

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەكی گرنگ هەیە نابێ لـــێی بـێ هـەواڵ بین، ئەویش ئەوەیە كە ئێمە كاتێك دەڵێین دەبێ سەرەتا خـەڵك لـە بنەڕەتەكانی ئیسلام تێبگەیەنین، ئەوە تا ڕادەیـەكی زۆر پەیوەنـدی هەیە بەو واقیعەوە كە ئێمە تێیدا دەژین، هەر بۆیەش لێكدانـەوەی زانایان و شێوەی قسەكردنی زانایان دەربارەی قورئان و سوننەت لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێك و لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێـك فـەرقی هەیـە،

بۆچی؟ چونکه بۆ نموونه: مامۆستا سەعیدی نورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تورکیا تەماشا دەکات خەڵك تووشی قەیرانی ئیمان بوون و خەریکن هەر خوانەناسن، بۆیە ئەو هەر خەریکی مەسەلەی ئیمان بووە، بەڵام (أبو حامد الغزالي) خوا لێی رازی بێ لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە سەردەمی ئەودا زۆربەی خەڵك گیرۆدەی دنیاویستی و ماددەپەرستی بوونەو زیادەڕۆیی یان لە ئارەزووخوازیدا کردوە، ئەو بە زۆری لەو ڕووەوە کاری کردوە، هەروەها (ابن تيمية)و (عبدالقادر الجيلاني)و هەر کام لە زاناو پێشەوایانی دیکەی ئیسلامیش بە هەمان شێوە، جا ئەوەی کە بۆ خەڵکی ئەم رۆژگارەی ئێمە پێویستە وەبیریان بهێنرێتەوەو جەختی لەسەر بکرێ بە ڕای من چەند شتێکە گرنگترینیان ئەم سێیانەن:

یەکەم: مەسەلەی خوا بە یەکگرتن، تێیان بگەیەنین کە خواپەرستی دەبێ لە هەموو ژیانی ئینسان دا ڕەنگ بداتەوە، تۆ دەبێ لە هەموو شتێکدا خواپەرستی، لە هەموو ژیانت داو لە هەموو بوارەکاندا[1].

دووەم: گشتگیرێتی (شمولية)ی ئیسلام، چونکە زۆربەی خەڵك ئەگەر بڵێی ئیسلام نوێژو رۆژوو و زەکات و حەج و ئەخلاقی جوانو ئەو شتانەیە، دەڵێ ڕاستە، بەڵام کە دێیە سەر حوکم و

---

(١) لە بەرگی یەکەمی خواپەرستیدا و لە بابەتی یەکەمیدا بە درێژی باسی چەمك و واتای خواپەرستی (عبادە)مان کردوە.

سیاسەت و ئابووریی و قەزاو سوپاو ... هتد. دەڵێ جا ئیسلام عیلاقەی بەو شتانەدا هەیە؟

سێیەم: گونجانی ئیسلام یاخود شیاوێتی ئیسلام بۆ هەموو سەردەم و رۆژگارێك، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەندێك کەس بە شێوەیەکی هەڵە بیردۆزەی گوێرەیی (النظرية النسبية)یان گشتاندوە بەسەر هەموو شتێك دا، جا دەڵێن: باشە چۆن دینێك هەزارو چوارسەد ساڵ پێش ئێستا هاتبێتە خوار بە کەڵکی خەڵکێکی ئێستا دێت کە لە سەدەی بیست و یەکدا دەژین، خۆ ئەو گیروگرفتانەی کە ئێستا هەن ئەو کاتە نەبوون؟! دیارە سەرهەڵدانی ئەو جۆرە پرسیارو ئیشکالانەش لە زەینی ئەو جۆرە کەسانەدا هۆیەکەی ئەوەیە کە قیاسی ئیسلام دەکەنە سەر ئەو جۆرە بیروڕاو بیردۆزانەی کە زادەو بیروهۆشی ئینسانن و مەحکوومی کات و شوێن و ژینگەو دەوروبەرە تایبەتییەکانن وەك خاوەنەکانیان! بەڵام بێگومان ئەو قیاسە شتێکی هەڵەیە، چونکە ئیسلام هەڵقوڵاوی زانیاری بێ سنووری خوایە کە حاکمی تێکڕای (بوون)ە، پاشان ئێمە کە دەڵێین ئیسلام بە کەڵکی هەموو کات و چاخ و سەردەمێك دێت، مەبەست لەم قسەیە بەم شێوەیە:

ئەو یاسایانەی کە لە ئیسلامدا چەسپاو و نەگۆڕ (ثابت)ن، پەیوەستن بەو لایەنانەوە کە لە ژیانی ئینساندا نەگۆڕن، بۆ نموونە:

خوای بەرزو مەزن ناگۆڕێ، بۆیە ئیسلام ئەو شتانەی کە دەربارەی خوا (عزّوجل) فەرموویەتی نەگۆڕن، هەروەها پەیوەندی بە خواوە، وە عیبادەت بۆ خوا ناگۆڕێ، هەروەها ئیسلام چەند یاسایەکی گشتی و بنەڕەتی نەگۆڕی لە ڕووی حەلاڵ و حەرامەوەو لە هەموو بوارەکانی حوکم و سیاسەت و جەنگ و ئاشتی و موعامەلات و ئابووری و لایەنی خێزانیدا داناون.

بە کورتی هەموو ئەو شتانەی کە جێگیرو چەسپاوو نەگۆڕن ئیسلام شتی نەگۆڕی بۆ داناون، بەڵام بۆ زۆر شتی دیکەی گۆڕاو لە بوارەکانی سیاسەت و حوکم و جەنگ و ئاشتی و ئابووری و ... هتددا ئیسلام مەجالێکی زۆری هێشتۆتەوە بۆ ئیجتیهادی ئینسان بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییانە پڕ بکاتەوە بە گوێرەی پێویست و بە پێی گۆڕانکاریی یەکانی کات و شوێن و ژینگەکان.

## سێیەم:- ڕووکردنە هەموو چین و توێژەکان:

بەڵێ بۆ بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی و دروستکردنی ڕای گشتی و تەوژمێکی کاریگەر دەبێ ڕوومان لە هەموو چین و توێژەکان بێ، وەك کۆمەڵی پێغەمبەر ﷺ، تەماشا دەکەین ئەوانەی کە ئیمانیان پێ هێناوە لە سەرەتاوە، لە سەرجەم توێژەکان بوون: (ئافرەت) وەك (خدیجە) خوا لێی رازی بێ، (پیاو) وەك (أبوبکر) خوا لێی رازی بێ، (کۆیلە) وەك (زید بن الحارثة) خوا

لێی رازی بێ، (منداڵ) وەك (علي بن ابی طالب) خوا لێی رازی بێ، کەواتە: مسوڵمانە یەکەمەکان ئافرەت و پیاو و منداڵ و ئازادو کۆیلەیان تێدابووە، هەروەها دواییش بە هەمان شێوە حاڵەتەکە بەردەوام بووەو بانگەوازە کە گشتگیر بووە بۆ سەرجەم چین و توێژەکان و هەم دەوڵەمەندو هەم هەژارو هەم سپی پێست و هەم رەش پێست و هەم خاوەن پایەو هەم رووتەڵ و هەم عەرەب و هەم غەیرە عەرەب و هەم پیاو و هەم ئافرەت... بە کورتی: وردو درشت و نێرو مێ گەورەو بچووکیان تێدا بووە، جا ئێمەش دەبێ روو بەکارە ئیسلامییەکەمان بکەینە هەموو چین و توێژەکان نەك هەر لە جوغزو بازنەی چین و توێژێك یان نوخبەو هەڵبژاردەیەك دا قەتیس بمێنێ، بەڵێ دەبێ روو بکەینە هەموو خەڵك وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ وای کردوە، بەڵێ بە تەئکید ئێمە ئێستا چینی خوێندەوارو چینی تازە پێگەیشتوو گەنجمان دەبێ زیاتر مەبەست بێ، و تەرکیزمان لەسەر ئەوان بێ بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە کە خەڵکی عەشایەرو کەسانی ریش سپی و خەڵکی لادێ و چین و توێژەکانی دیکەش پشت گوێ بخەین، چونکە هەر کەس و توێژە دەورێکی خۆی دەبینێ کە خەڵکی دیکە ناتوانێ ئەو دەورەی وی ببینێ، ئنجا دیارە کۆمەڵگاش لە هەموو چین و توێژەکان پێکدێ، نەك لە یەك و دووان، بۆیە دەبێ هەوڵبدەین کە کاری ئیسلامیی بەرینە نێو هەموو چین و توێژەکانەوە، دیارە هەر چین و توێژەش شێوازی خۆی

دەوێ، بۆ نموونە: تۆ کـە قـسـە لەگـەڵ پزیـشکێك دەکـەی دەبـێ شێوازەکەت جیابێ لە هی ئەندازیارێك و هی ئەویش جیابێ لە هی سەرۆك عەشیرەتێك هی ویش جیابێ لە شێوازی قـسەکردن لەگـەڵ مەلای مزگەوتێك یان شێخێکی طـەریقەت ...هتد. دیارە هەر کام لەوانە شێوازی تایبەتی خۆی دەوێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کـە ئێمـە دڵنیاو مسۆگەر بین کە: بەوە بنکەی جەماوەریمان بۆ دروست دەبێ و دەبینە تەوژم کە ڕوومان لە هـەموو چـین و توێـژەکان بـێ و کـارە ئیسلامییەکەمان لە توێژێك و چـینێکدا یـان لـە چـەند توێـژ و چینێکدا کورت هەڵنەهێنین.

## چوارەم: بە کردەوە دڵسۆز و ئەمینداربوون بۆ خەڵـك:

با جارێکی دیکەش سەرنجی سیرەو ژیـانی پێغەمبـەران بـدەین، ئایا پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا (علیهم الـصلاة والـسلام) چـیان فەرمووە: ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاتِ رَبِّي وَأَنَاْ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾[1] واتە: من بۆ ئێـوە دڵـسـۆزم وە ئەمینـدارم( (ناصِـح) یـانی بـە پـەرۆش و دڵسـۆز، واتە: من هیچ مەبەستێکم نیە، ئەوە نەبێ کە قازانج بـە ئێوە بگەیەنم، چونکە (نصح) یانی دڵسـۆزیی و پاکیی، جـا ئـەوە بەراستی نوختەیەکی زۆر گرنگە کە ئینسان نەك بە قـسە وا بڵـێ بەڵکو بە کردەوە وا بکات و بۆیـان بـە پـەرۆش و دڵـسۆز بـێ، وە

(١) الأعراف (٦٨).

لەگەڵیان ئەمین بێ و هیچ لە دینی خوایان لێ پەنهان نەکات و لێ نەشارێتەوەو، هەر شتێك خێرو قازانجی دنیاو قیامەتی ئەو خەڵکەی تێدایە پێیان ڕابگەیەنێ و پێیان بڵێ، جا پێیان خۆشە یان پێیان ناخۆشە کەیفی خۆیانە، گرنگ ئەوەیە ئەو هەوڵبدات بە باشترین شێواز چی هەق و چاکە پێیان بڵێ، نەك لەگەڵ هەواو ئارەزووی خەڵکدا بڕوا، هی وا هەیە دەیەوێ خەڵك لەخۆ ڕازی بکا نەء، ئەتۆ هەوڵبدە خوا لە خۆت ڕازی بکەی و سوود بە خەڵك بگەیەنی و بزانە ئەو خەڵکە چی پێویستە بۆ دونیاو قیامەتی و چی لە بەرژەوەندی دایەو کام لە حەقیقەتەکانی دینی پێویستە، یان لێی ون بووە، یان پێویستە بیری بخرێتەوە، بۆی باس بکە.

## پێنجەم: تەفاعولکردن لەگەڵ خەڵکدا و بەشداریکردنی خۆشی و ناخۆشییەکانیان:

بەڵێ برایانی خۆشەویستم! کاتێك بنکەی جەماوەریی دروست دەبێ و کاری ئیسلامیی دەبێتە تەوژم، کە ئێمە بتوانین تەفاعول بکەین لەگەڵ خەڵك و کارلێکیان لەگەڵدا بکەین، کاریان تێبکەین کارمان تێبکەن و ببین بە بەشێك لەو خەڵکەو جیسمێکی غەریب نەبین و وا هەست نەکەن کە ئێمە جیسمێکی نامۆو غەریبین و خەڵك لێمان نەسڵەمێتەوە دیارە من لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە ئەوان چیان پێ خۆشە ئێمە ئاوا بکەین، یان چی

دەڵێین ئێمە وا بڵێین! چونکە ئەو کاتە مانای وایە ئێمە تایبەتمەندیەکانی خۆمانمان لەدەست داوەو بووینە بەشێك لە واقیعێکی خراپ، نەء، بەلاّم گرنگ ئەوەیە خەڵك هەست بە نامۆیی مان نەکات بەو مانایەی کە تۆ لە هەموو شتێکی ئەو خەڵکە لە کەمیندا نەبی و هەموو شتێکی ئەو خەڵکە هەر رەفز نەکەی، تەماشا بکەن پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە هاتوون وەنەبێ هەموو شتێکی ئەو خەڵکەیان هەر زەڕب بەسەردا هێنابێ، بۆ وێنەی پێغەمبەری پێشەوامان (علیه الصلاة والسلام) کە هاتوە لە نێو عەرەبەکاندا کۆمەڵێك شتی باش باش هەبووە، ئەو شتە باشانەی ئەوانی لە جێی خۆیدا چەسپاندوەو لای نەبردوون، بۆ وێنە: خزمەتی کەعبەیان کردوە، پەردەیان بۆ دروست کردوە، طەوافی دەوری کەعبەیان کردوە، ئاویان داوە بە حاجییان، کۆمەڵێ شتی باش باشیان کردوە، هەروەها کۆمەڵێك خەسڵەتی باش باشیان هەبووە، وەك: میوانداریی، ڕاستگۆیی، جوامێریی، ئازایەتی... هتد. پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) نەیگوتوە ئەو سیفەتانە لەبەر ئەوەی هی سەردەمی نەفامیین هەموویان لابەرن.

بەڵکو هەرچی شتی چاك و بەسوود بووە هێشتوویەتیەوە، بۆ نموونە: لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: ((لقد شَهِدتُ في دار عبدالله بن جُدْعان حِلْفاً ما أُحِبُّ أنَّ لي به حُمر النَّعَمِ لو أدْعى اليه

في الإسلام لأجَبتُ ))[1] که مەبەست پێی (پەیمانی جوامێران)ەکـە کۆمەڵە خەڵکێك ڕێککەوتوون نەهێڵن هیچ کەسـێ لە مەککـەدا زوڵمی لـێ بکرێ، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەشداری ئەو پەیمانە بووەو فەرموویەتی ئەگەر لە ئیسلامیشدا بانگ بکرێم بـۆ شتێکی وا هەرچەندە لە سەردەمی نەفامییش دا بـووە... ئـەوە بـە دەمیەوە دەچم و بەشداریی تێدا دەکەم.

کەواتە: گەل و کۆمەڵگایەکی کافرو نامسوڵمانیش ئەگەر خێرو چـاکەیەکیان هـەبور دەبـێ پـشـتگیریی بکـەین. چ جـای گـەل و کۆمەڵگایەکی وەك خەڵکی کوردستان کە (الحمـدلله) خـەڵکێکی مسـوڵمانەو گەلێك شـتی چاکیش کە لە ئیسلام فێـری بـووە لـە نێویدا ماوە، بەڵام بێگومـان خلتەو خـاڵی ڕەگـەڵ کـەوتوە، بەڵـێ ئەگەر ئێمە لەگەڵ هەموو شتێکی باشی خـەڵك دا بـین وە لەگـەڵ خۆشی و ناخۆشییەکانیان دابـین بـەوە تـەفاعول لەگـەڵ خەڵکـدا دەکەین جا هی وا هەیە کە ڕەخنە لە ئێمە دەگـرێ وەك (کۆمـەڵی ئیسـلامیی) کـە بەشـداری هەڵبـژاردن و بەشـداری حکومـەتمان کردوە کاتی خۆی بەشداری جەنگی دژی ڕژێممان کردو لـەو بـەرەو سەنگەرانەدا بووین کـە حیزبـە نەتـەوەیی و عـەلمانی یـەکانیانیان تێدابوون، بەڵام ئێمە پێمان وانیە شتێکی خراپـان کردبـێ بـەڵکو

(١) سیرة إبن هشام، ج ١ ص ١٣٤.

پێمان وایه شتێکی زۆر چاکمان کردوه، بۆچی؟

چونکه ئەو شتانه له خودی خۆیاندا شتی چاك و شەرعیین، ئایا تۆ دیفاع بکەی له ماڵی خۆت، له وڵاتی خۆت، له میللەتی خۆت، شتێکی باش نیه؟! بێگومـان باشـه، چـونکه خـوا فەرموویـەتی: ﴿... فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ .. ﴾ (البقرة ١٩٤)، پێغەمبەری خـواش ﷺ فەرموویـەتی: (( مَن قُتل دون مظلمته فهو شـهيد )) (رواه ابـوداود) . واتـه: هـەر کەسێك لەسەر بەرگری لێکردنی خۆی کـه سـتەمی لـێ نـەکرێ بکوژرێ ئەوه شەهیده، هـەروەها فەرموویـەتی: (( مَـن قُتـل دون ماله فهو شهيد )) (رواه البخاري). واته: هەر کەسێك لەسـەر مـاڵ و سامانی بکوژرێ شەهیده.

کەواته: ئێمه که لـه خـەباتی ڕزگـاریخوازیی میللەتەکەمانـدا بەشداریمان کردوه شتێکی باشمان کـردوەو بـه ئـەرکێکی شـەرعی خۆمان هەڵساوین، هەرچەنده خەڵکی دیکەی عەلمانیش بەشدارییان کردوه، بەڵام هەر کەسه به ڕێی خۆیدا، خۆ ئێمـه نەچـووینه سـەر ڕێچکەو ڕێبازەکانی وان، بەڵکو ئێمه به ئەرکێکی شەرعی خۆمان هەڵساوین و شتێکیش که له خودی خۆیدا شەرعی و چاك بوو بـه هۆی ئـەوەوە کـه کەسـانێك بـه شـێوەیەکی هەڵـەو بـه ڕێیـەکی ناشەرعیدا دەیکەن خراپ نابێ.

ئنجا مەسەلەی هەڵبژاردن ئەگەر ئەو خەڵکه نوێنـەرانی خـۆی

هەڵبژێرێ و لە شوێنێك کۆببنەوەو لە نێو خۆیان دا ڕاوێژو تـەگبیر بکەن دەربارەی دین و ژیـن و کاروبـاری خـەڵك و کۆمەڵگەکـەیان بێگومان ئەوە پێویـست و فەڕزیـشە نـەك هـەر ناشــەرعی نیـە، چونکە هەر دەبێ خەڵك و میللەت ئەنجوومەنێکی هەبێ و هەندێك تەگبیرکـەرو مــشوورخۆری هــەبن، هەرچـەندە ئـەو ئەنجوومەنـە شەرعییەی ئێمە دەمانەوێ ئەوە نیە کە ئێستاکە هەیە، بـەڵام بـە حەرحاڵ خۆی لە خۆیدا ئەوە کـە میللـەت ئەنجوومـەنێکی هـەبێ تەگبیری بۆ بکات و مشووری لـێ بخوات و یاساو تەرتیبات دابنـێ بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژیانی، ئەوە بێگومان شتێکی شـەرعی و چاکە، چونکە بەدیلی ئەوە بریتیە لە پاشاگەردانیی (فوضـی) وەك شاعیرێك گوتوویەتی:

((لا يصلح الناس فوضى لاسُراة لهم

ولا سُراة لهم إذا شرارهم سادوا))

واتە: خەڵك چاك نابێ بەوەی کە فەوزاو پاشـاگەردانی بـێ و هـیچ مــشـوورخۆیان نـەبن، یـان ئەگـەر مــشـوورخۆرەکانیان کەسـانی خراپەکار بن، ئنجا دەربارەی بەشداریی کردنمان لە حکوومـەت دا، هاتوون پێیان گوتووین: ئەوە حکومەتێکەو تەشکیل دەبێ ئێـوەش دەعوەت دەکەین بەشدار بـن، بێگومـان ئێمـە تێبینـی و ڕەخنـەی زۆرمـان لەسەر پەرلەمان و حکومـەت هەیـە، بـەڵام ئایـا ئەگـەر هەموو حکوومەتەکەشمان بەدەستەوە بێ بە شـەو و ڕۆژێکـان ئـەو وەزعەمان بۆ چاك دەکـرێ؟ بێگومــان نـەخێر، ئنجـا ئایـا بۆچـی

چووینه نێوی؟! بۆ سێ ئامانج:

یەکەم: بۆ ئەوەی ئەوەندەی پێمان دەکرێ و لە دەستمان دێ سوود بە خەڵك وکۆمەڵگای خۆمان بگەیەنین لە کەناڵی پەرلەمان و حکوومەت و دامودەزگا ڕەسمیەکانەوە.

دووەم: وە بۆ ئەوەی خەڵکەکەمان مەشق پێ بکەین و ڕای بهێنین لەسەر کاروباری ئیداریی و چاویان بکرێتەوەو شارەزا بن و پسپۆڕیی یان پەیدا بێت.

سێیەم: وە بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بزانێ کە ئێمەش بڕوامان بەوە هەیە کە میللەتەکەمان کیانی هەبێ، دەوڵەتی هەبێ، بوونی هەبێ، وە لە وڵاتی خۆیدا ئازادو سەربەخۆ بێ و، کەس زوڵمی لێ نەکات و نەیچەوسێنێتەوە، چونکە ئێستا هی وا هەیە کە تۆ بەشداریت نەکرد، وات بۆ تەفسیر دەکات کە تۆ دەڵێی با ڕژێمی بەعس بێتەوە، یان با عەرەبی شۆڤێنی بمان چەوسێنێتەوە!! جا چ بە هاندەری چەواشەکارانە بێت وە چ بە هۆی ئەوەوە بێ کە ئێمە ناناسێ!

کەواتە ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین تەفاعول بکەین لەگەڵ کۆمەڵگای خۆماندا بەڵام تەفاعولی ئیجابی نەك تەفاعولی سەلبی، تەفاعولی ئیجابی بەو مانایەی لەگەڵ هەموو شتێکی باشیان دا بین. بەڵام لە شتی خراپ و هەڵەدا هەڵوەستە بکەین و ڕەخنە بگرین و هەوڵبدەین بۆیان ڕاست بکەینەوە.

## شەشەم: لێزانی و دانایی :

گەلێك جاران لێ نەزانیی و ناشێیی و ناوەستایی زەرەو زیانی گەورەمان لێ دەدات و قسەی خەڵكی نامسوڵمان لەسەر ئەهلی ئیسلام سوار دەكات.

بەڵێ بەڕاستی تەنیا ئیخلاص بەس نیە بۆ كاری ئیسلامیی، بەڵكو دەبێ وەك چۆن مەبەستت پێ خوایە، دەبێ لێزان و عاقڵ و حەكیم و وەستاو كارامەش بی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((إن الله يحب إذا عمل أحدُكُم عملاً أن يُتقِنَه))[1] واتە: خوا پێی خۆشەو حەز دەكا ئەگەر یەكێك لە ئێوە كارێكی كرد بە لێزانیی و وردەكاریی بیكات.

كاری وردەكارییش ئەوەیە كە بەلای كەمەوە زەرەری لە قازانجی زیاتر نەبێ، بەڵام ئەو كەسەی كارێك دەكات هەرچەندە بە ساغی بۆ خوا بێ، مادام زەرەرێك بدات بنە تۆی خۆی نەكاتەوەو زەرەری لە قازانجی زیاتر بێ بە هۆی نەزانیی و بێ حیكمەتییەوە، ئەگەر حەوسەد جار مەبەستی پێ خوا بێ لێی وەرناگرێ، چونكە خوا كاری كەسێك وەردەگرێ كە وەكو چۆن مەبەستی پێ خوایە، بە پێی شەرعی خواش بێ، شەرعی خواش فەرمان دەكات بە عەقڵ و بە بیركردنەوەو بە وەستایی و بە حیكمەت و بە لێزانی، خوای

(١) رواه البيهقي وابن عساكر وابو يعلى عن عائشة رضى الله عنها.

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ...﴾ (النحل ١٢٥) وە فەرموویەتی ﴿.... وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ... ﴾ (البقرة ٢٦٩) لە باسی ماڵ بەخشین دا وا دەفەرموێ، واتە کە ماڵت بەخشی دەبێ حەکیمانە بیبەخشی، وەکو چۆن کە خەڵکت بۆ لای خوا بانگ کرد دەبێ حەکیمانە بانگی بکەی!

## حەوتەم : دادگەریی و ئینصاف :

هۆکاری حەوتەم و کۆتاییش ئەوەیە کە ئێمە دادگەر بین و لەگەڵ خەڵك بە ئینصاف بین، کاتێك چاکەیەکیان لێ دەبینین و شتێکی باشیان تێدا دەبینین هەر لەبەر ئەوەی نەیارمانن یان ڕقمان لە هەندێك لە کردەوەکانیان هەڵدەستێ، چاکەکانیشیان نادیدە نەگرین، برایانی خۆشەویستم! هەموو کەس ئینسانی دادگەرو بە ویژدانی خۆش دەوێ و ڕقی لە بابای بێ ئینصاف و نادادگەرە.

ئنجا بێگومان هەر کەسێك بگری هەرچەندە زۆریش خراپ بێت، بەڵام هەرچۆن بێ هەندێك چاکەی هەر هەن و دەتوانی ئاماژە بە چاکەکانی بکەی و بڵێی: ئەوەت چاکەو ئەوەت چاکە، بەڵام فلان شتەشت خراپەو ئەگەر ئەویشت لابردبایە زۆر چاك بوو!

دیارە زۆر دوورەو بگرە موستەحیلیشە کە ئینسان وای لێ بێ هیچ چاکەیەکی تێدا نەبێ، هەر چۆن بێ هەندێك تروسکایی هەر

تێدا دەمێنێ، جا ئەوە کە ئێمە دان بە چاکەی خەڵکدا بێنن و لەگەڵیان دادگەر بین و بێئینصاف نەبین، ئەوەش وا دەکات کە ئێمە زیاتر بتوانین تەفاعولیان لەگەڵدا بکەین، چونکە ئەو کاتە لێمان ناسڵەمنەوەو دڵیان پێمان خۆش دەبێ و دەڵێن: دیارە ئەوانە بە ئینصافن! من دەزانم زۆر خەڵکی عەلمانی هەن کە لەگەڵ ئێمەدا بێ ئینصافن و نادادگەرو بێویژدانن و دان بە هیچ چاکەیەکی ئێمەدا ناهێنن، بەڵام ئەوە نابێتە پاساو و بیانووی ئەوە کە ئێمەش لەگەڵ ئەواندا وابین، چاوتان لێیە چۆن لەبەر بێویژدانی یان لەگەڵمان ئەوانمان لەبەرچاو ڕەش دەبێ و دەڵێین وەڵڵاهی ئەوان زۆر بێ ئینصافن! بۆچی هەمیشە هەر قسەمان لە دژ دەکەن و لێمان دەخوێنن و جارێك چاکەیەکمان ناڵێن، ئایا ئێمە هیچ شتێکی باشمان نیە؟!، بۆ وێنە جارێك یەکێك لەوانە لە ڕۆژنامەیەك دا گوتبووی: (ئەو ئیسلامی یانەی کە هەرگیز تەقەیەکیان- بۆ دیفاع لە کوردستان – نەکردوە، بەڵکو تەنانەت هەر مینگەیەکیشیان نەکردوە)، جا من ئەو کابرایە و ئەوەی لە پشتیشیەوەتی بە هەڵوێستێکی وا لەبەرچاوم دەکەوێ و دەڵێم: ئەوانە زۆر بێ ویژدانن! چونکە ڕەنگە کاتی خۆی ئەو (یەس یەم)[1]ی کردبێ بۆ بەعس کە ئێمە بەو شاخانەوە بووین، مانای

(١) (یەس یەم)، کورتکراوەی (یسار، یمین)ە کە لە کاتی مەشقی سەربازیدا دەگوترا.

وایە من ئەو کابرایەم لەبەرچاو دەکەوێ، بۆچی؟! چونکە من دەڵێم: بۆچی باسی ئەو هەموو شەهیدانەی ئێمە ناکات لە (کۆڕێ) لە (کەرکوکێ) لە (بناری قەندیل) لە (مەلەکان) لە (قەرەداغ) لە (هەڵەبجە) لە (هەورامان)، چۆن ئەو هەموو شەهیدانەمان بووەو نایانبینێ، بۆ کوێر بووە؟!

بەڵێ بەڕێزان بێ ئینصافی یەکجار لەسەر دڵ قورس و ناخۆشە، با ئێمەش ئاگامان لێ بێ، بێ ئینصاف نەبین و چاکەیەکمان لە هەر کەسێك بینی چاکەکەی ببینین و دانی بۆ پێدا بێنین وەك چۆن خراپەو کەموکوڕییەکەشی دەبینین، خوای پەروەردگاریش هەر فەرمان بەوە دەکات وەك فەرموویەتی: ﴿.. وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى ...﴾ (المائدة ٨) واتە: با ڕق هەڵسانتان لە کەسانێك واتان لێ نەکات لەگەڵیان نادادگەربن، دادگەر بن ئەوە لە تەقواوە نزیك ترە، چونکە بەشێك لە تەقوا ئەوەیە ئینسان دادگەر بێ و زاڵم نەبێ، تەنانەت لەگەڵ کەسانێکیشدا کە نەیارو ناحەزیشن .

جا بەڕێزان! ئەوانە حەوت هۆکار بوون و دیارە هۆکاری دیکەش هەن بەڵام ئەوانەی باسمان کرد گرنگترینیان بوون بۆ ئەوەی کارو چالاکی ئیسلامیی تەوژم و ڕای گشتی دروست بکات و بنکەیەکی جەماوەریی دروست بکات، خوای پەروەردگار یارمەتیمان بدات کە ئەو هۆکارانەی پێویستن بۆ ئەوەی ببینە پێشەنگ و سەرقافڵە لە

خۆمانیاندا بهێنینه دی، وه ئەو هۆکارانەش که پێویستن بۆ ئەوەی که پێگەی ئیسلام بە قوەت بکەین له ولاتی خۆماندا و بیکەینە ئەوڕژمێك که هەموو چین و توێژەکانی لەگەڵدا بن و سەرەنجام بنکەیەکی جەماوەریی وا بە هێزو پێز بنیات بنێین که بگونجێ کیان و قەوارەیەکی ئیسلامیی لە باوەش بگرێ کە شەریعەتی خوای بە بەزەیی و دادگەر لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەراندا پیادە بکات.

وصلى الله وسلم على محمد وآله وصحبه أجمعين
والحمدلله رب العالمين .

# نێـوەڕۆك

## ئەم نامیلکەیە

باسی دوو بابەتی گرنگی کارو چالکی ئیسلامی دەکات ، کەبریتین لە :

1 - چۆنیەتی بوونە پێشەنگ

2 - چۆنیەتی بنیاتنانی جەماوەری

شایەنی باسیشە بۆ هەرکامێکیان حەوت هۆکاری گرنگ بخەینە روو کە لەم رۆژگارەماندا پێویستن بۆ هێنانەوەی هەر کام لەو دوو ئامانجە گەورەو گرنگەی کاری ئیسلامی .


**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شورێن پالاس

ت: 2518138 – 2230908 – 2221695

موبایل : 07504605122 – 07701387291



tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com